# ڕەهەندی ئایین

لە

# شیعری کلاسیکی کوردی

کرمانجی خواروو

نەوزاد کەلهوڕ

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

2008

# رەهەندی ئایــین
# لە شــیعری کلاســیکی کوردی

(کرمانجی خواروو)

نوسینی

نەوزاد کەهور

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

نـــاوی کتێـــب: ڕەهەندی ئایین لە شـیعری کلاسـیکی کـوردی
نوسـەر: نەوزاد کەڵـهوڕ
بڵاوکردنـەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
تـایتلی بـەرگ: نـەوزاد کۆیی
بـەرگ : أمیـن مخلـص
نەخشەسازی ناوەڕۆک: عزەددیـن محەممەد عومـەر
نـۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکـەم ١٤٢٩ ک - ٢٠٠٨ ز

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (      ) ساڵی(٢٠٠٧)ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشـــەکی

کۆمەڵگای کوردی گەر لەرووی زانستو تەکنـەلوژیادا نـەیتوانیبێت بگاتـە ئاسـتی وڵاتانی پێشکەوتوو، ئەوا لە ئەدەب بەگشتیو هۆنراوە بەتایبەتی توانیویەتی قەرەبووی ئەو بۆشاییە بکاتەوە.

بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی دەست ئێمە کەوتوون، کۆنترین هۆنراوەی کوردی لـە بابـە تـاهیری هەمەدانیـەوە دەسـت پێـدەکات، کـە بەشـێوەی لـوری دووبەیتـەکانی خـۆی نوسیوەتەوە، دوای ئەوە پشت بە پشت هاتووە تاکو سەدەی هەژدەمینو سەدەی نۆزدە، کە شاعیری زۆرترو زانیاری زیاترمان لەبارەیانەوە هەیە، کە پێش ئەو مێژووە نوسـەرو شاعیرانی کورد بە زمانانی تری رۆژ هەلاتی بەرهەمەکانی تریان دەنوسـی، بەتایبـەتی نوسینی هۆنراوەو نامەگۆڕینەوەی نێوانیان، تاکو ئێستاش بەتەواوی ساغ نەبۆتەوە ئایا بۆچی ئەو بەرهەمە ئەدەبیانـە بـەزمانی بێگانـە نوسـراون! ئایـا هۆیەکـەی بـۆ ئـەوە دەگەرێتەوە کە کورد قەوارەی سیاسی خۆی نەبووە، یاخود نوسـین بـە زمـانی کـوردی بەڵگە بووە لەسەر کەم توانایيو بێدەسەڵاتی نوسەرەکە، یـاخود نوسـەرانی کـورد بـە زمانی زگماکی خۆیان نەیان خوێندووە، ئەوەش وای کردبێ نەزانن بـە زمـانی کـوردی بنوسن، ئەم کارە بەردەوام بوو تاکو نالی مەزن هات ئەو رێچکەیەی شـکاندو دەسـتی کرد بە هۆنراوە نوسین بە زمانی کوردی بێئەوەی سڵ بکاتەوە، بۆ سـڵ بکاتـەوە نـالی

کە دێتو شیعر بە زمانی کوردی دەنوسێ لەبێ دەسەڵاتی نیە چونکە نالی توانای بەسەر زمانەکانی تریشدا هەیە بۆ ئەوەی شیعری پێبنوسێ.

فارسو کوردو عەرەب هەرسێم بەدەفتەر گرتووە
نالی ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە دیوانی هەیە(١)

نەك هەرئەوەندە نالی توانای نوسینی هەیە بە هەرسێ زماندا، بەڵکو بەرەنگاری ئەوانەش دەبێتەوە، کە گلەیی لە نالی دەکەن کە لە زمانی کوردی حالی نابنو داوای مانای لێ دەکەن.

کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆکردیە، خۆکوردییە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا(٢)

وشەی کلاسیك لە بنەرەتدا، وشەیەکی لاتینە لەوشەی (کلاسیکوس)ـەوە هاتووە کەمانای چین (طبقە) دەگەیەنێ، بەو مەبەستەی ڕێبازی کلاسیك بۆ چینێك دەگوتراو دەنوسرا کە ئاستی ڕۆشنبیریان بەرز بوو، ئەو ڕێبازەش لە رووی ئەدەبییەوە بەمانای لاسایی کردنەوە دێت، واتە لاسایی کردنەوەی ئەدەبی یونانی، کە ئەرستۆ لە کتێبی شیعردا باسی کردووە، پاشان کتێبەکەی هوراس بەناوی (هونەری شیعر) لە سەرەتای سەدەی شازدە ئیتالیەکان ئەو دوو کتێبەیان وەرگێڕایە سەر زمانی خۆیان، پاشان لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا بڵاوبۆوە، دیارە ئەو دوو کتێبە کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر ئەدەبی ئەوروپی، پاشان بە هۆی نوسەرە عەرەبەکان کومەڵێك کتێب وەرگێردرانە سەر زمانی عەرەبی.

لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام لە نیمچەدوورگەی عەرەب و، پاشان بڵاوبونەوەی بە وڵاتانی دەوروپشت گەلی کوردیش یەکێك بووە لەو میللەتانەی کە ئاینی ئیسلامی قبول کردووە، لە ئەنجامی ئەو تێکەڵاو بوونەی کە لە نێوان میللەتانی

ئیسلامدا هەبووە، توانراوە سوود لە شارستانیەتی یەکتری وەربگرن و بکەونە بەر کاریگەری یەکتری.

سەردەمی بابانەکان بەسەردەمێکی زێرین و پرشنگدار دادەنرێت، بۆ بوژانەوەی ئەدەبی کلاسیکی کوردی، پاش هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ کوردستان هیچ سەردەمێك وەکو سەردەمی بابانەکان پێشکەوتنی ئەدەبی بەخۆیەوە نەدیوە[٣]، ئەو پێشکەوتنەش لەسایەی حاکمانی بابانەکانەوە بووە، کە زەمینەیەکی چاکیان رەخساندبوو بۆ شاعیرانی سەردەمەکەی خۆیان، ئەوە بوو نالی توانی قوتابخانەی شیعری بابان دابهێنێت، سالم و کوردیش تەواوکەری ئەم قوتابخانەیە بوون، شیعری کلاسیکی کوردی درێژەی پێدرا تاکو بە کۆچی دوایی کردنی عەلی کمال باپیر دواتنوك لە دیاردەی شیعری کلاسیکی وشك بوو.[٤]

من لێرەدا نامەوێت باس لە خاسیەت و تایبەتمەندیەکانی شیعری کلاسیکی کوردی بکەم، بەڵکو هەوڵم داوە ئەوە بسەلمێنم کە چەندە قورئان و فەرمودە کاریگەریان هەبووە نەك هەر لەسەر شاعیرانی کلاسیکی کوردیمان بەڵکو قورئان کاریگەری لەسەر ئەوروپاش هەیە، لەسەر تۆلستۆی هەیەتی، لەسەر لامارتین هەیەتی، لەسەر پۆشکین، لەسەر بەرنادشۆ هەیەتی، بەرنادشۆ ئەگەر نەمردایە شانۆنامەیەکی تایبەتی لەسەر پێغەمبەرﷺ دەنووسی، من ئەوەم لە لێکۆڵینەوەیەکدا خوێندۆتەوە، هیچ نوسەرێکی ئەوروپی نیە زۆر گەورەبێ نەکەوتبێتە ژێر کاریگەری تەورات و ئینجیل و قورئانەوە[٥]. شاعیرانی کلاسیکی کوردیش هەرهەموویان لە مزگەوت و حوجرەکان فێری خویندن و نووسین بوینە، کەواتە رۆشنبیریان رۆشنبیریەکی ئاینی بووە، جا هەریەکێك لێکۆلینەوە لەسەر شاعیرانی کلاسیکی بکات دەبێت لێکولەرەوە دەرچووی مزگەوت بێت، یان هەر هیچ نەبێت دەبێت روشنبیری ئاینی هەبێت، ئەگینا زۆر زەحمەتە راستی بپێکێ.

لە کۆتایدا دەمەوێ ئەوە بە خوێنەر بلێم هەندێك لەو باسانەی نێـو ئـەم کتێبـە لـە گوڤارو رۆژنامەکانی نێوخۆدا بلاو کراونەتەوە، جگە لـەوەش شـاعیرانی کلاسـیکیمان گەلیك لەوە زیاترن، بەلاّم ئەوانەی کە من باسم لێوە کردوون ئەو شاعیرانەن کـە زیـاتر لەسەر زمانی خەلکەوەن.

سەرچاوەو پەراوێــز:

١- دیوانی نالی / لێکولینەوەو لێکدانەوە / مەلا عبدالکریمی مدرس / کوری زانیاری کورد.
٢- هەمان سەرچاوە.
٣- دیــداری شـیعری کلاسـیکی کـوردی/ ئامــادەکردنی حەمــە سـعید/ دەزگـای رۆشــنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی.
٤- شاعیرانی تریش هەیە پاش ئەم علی باپیر شیعری کلاسیکی دەنوسن یاخود نوسیویانە، بـەلاّم هێندە بەناوبانگ نیە.
٥- چاوپێکەوتنێك لەکەڵ شاعیر (لەتیف هەلمەت) رۆژنامەی کۆمەڵ ژ (١٦٩) ٢٣/٤/٢٠٠٥.

نەوزاد کەڵهور
شۆرش- هەولێـر

# کاریگـەری ئایـین لە شـیعری نالـی

مەلاخدری کوڕی ئەحمەدی مکائیلی یە، لە گوندی خاكو خۆڵ لەدایك بووە.

نالی دامەزرێنەری قوتابخانەی* شیعری بابانە، ئەو ڕۆژگارەی نالی لـە ژیانـدا بـووە لەشاری سولیمانی، سەردەمی فەرمانڕەوایی بابانەکان بووە، میرەکانی بابان توانیبویان زەمینەیەکی لەبار دروست بکەن بـۆ تەقاندنـەوەی بـەهرەی شـیعری شـاعیرانی وەکـو (نالیو سالمو کوردیو مـەلاوەسمان)، دیـارە ئەمـەش وای لـە لێکولـەرەوانی شـیعری کوردی کردووە کە بڵێن لەپاش هاتنی ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام بـۆ کوردسـتان، هـیچ سەردەمێك وەکو سەردەمی بابانەکان، کوردستان بوژانەوەو گەشەکردنی بەچاوی خـۆی نەبینیوە[1].

نـالی ئەسـتێرەیەکی گەشـە لـە ئـەدەبیاتی شـیعری کلاسـیکی کـوردی، کـە ئـەم ئەستێرەیە هەتا دونیا بمێنێ، ئەم ئەستێرەیە لە درەوشـانەوەی خـۆی ناکـەوێت، نـەوە دوای نەوەش شانازی بە (نالی) یەوە دەکەن.

بەداخەوە دەڵێم (نالی) هەروەکو شاعیرانی سەردەمەکەی خۆی، گەلێك لایەنی شاراوە لە ژیانیدا بەدی دەکرێت.

تاکو ئێستا بەتەواوی بۆ لێکۆلەرەوانی شیعری کوردی ساغ نەبۆتەوە کە نالی سـاڵی چەند لەدایك بووە، د.مارف خەزنەدار دەڵێت ١٨٠٠ز لە دایك بووەو لە ساڵی ١٨٥٦ز کۆچی دوایی کـردووە[2]، (محمـد امـین زەکـی)یـش سـاڵی ١٢١٥ك بـۆ لـەدایکبوونی

---

*) قوتابخانە ئەوەیە بەیاننامەیەکی ئەدەبیی هەبێو خاوەنی پرۆگرام بێت.

دادەنێت، هەروەها عەلائەدین سەجادی دەڵێت نالی لە ساڵی ١٧٩٧ لەدایکبووەو لە ساڵی ١٨٥٥ز کۆچی دوایی کردوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە هیچ یەکێکیان لەمانە پشتیان بەسەرچاوەیەکی زانستیو باوەڕپێکراو نەبەستووە.(٢)

ڕونو ئاشکرایە نالی کوڕی پیاوێکی نەخوێندەوار بووە، رەنگە لە راستی دور نەکەوینەوە گەر بڵێین لە گوندی (خاكو خۆل) کە مەڵبەندی هاتنە دونیای (نالی)یە، کەسێکی خوێندەواری تیا نەبووە جگە لە مەلای گوند (ئەویش بەو مەرجەی کە گوندی خاكو خۆل مەلای هەبووبێت) جگەلە نەبوونی کەسی خوێندەوار، ئەو سەردەمەی نالی تیادا لە دایك بووە پاشی ئەویش خەڵکی بەوڕادەیە ئەو هوشیاریەی نەبووە، کە هەر منداڵێك لەدایك بێت، یەکسەر دەست بداتە قەڵەمو پەرەموچەکەی مێژووی لە دایکبوونی تۆمار بکات، بە تایبەتیش کەسێکی وەکو نالی کە کوڕی پیاوێکی هەژارو نەخوێندەوار بووە، لەپاشان کێ دەیزانی (خدر) دەبێتە ئەو (نالی)یە مەزنەی ئیمڕۆ؟

بۆیە من گەشبین نیم بەوەی کە ڕۆژێك دابێت بە شێوەیەکی دروست ڕۆژو ساڵی لە دایکبوونی (نالی)مان دەست بکەوێت، بەڵام ڕێگای تێدەچێت ڕۆژو ساڵی کۆچی دوایی ئەو شاعیرە مەزنەمان دەستگیر بێت لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ساڵی کۆچی دوایی کردنی نالی نزیکترە، لە ساڵی لەدایك بوونی.

٢- نالی لە گوندێکی دوور لە شارستانیەتی وەکو خاكو خۆل لەدایکبووە بەڵام لە شارێکی پێشکەوتووی وەکو ئەستەمبول کۆچی دوایی کردووە، کە دەوروبەرەکەی خوێندەوار بووە، بۆیە ڕێی تێدەچێت یەکێك لە دەوروبەرەکەی مێژووی کۆچی دوایی تۆمارکردبێت لە دامێنی کتێبێکی پەرزەرد، ئێستاش لە دەلاقەی چ مزگەوتێك یان ماڵێك کەوتبێت.

٣- کاتێك نالی دەگاتە ئەستەمبول، مرۆڤێکی ئاسایی نەبووە، تاکو لە دوورە وڵات بەهێمنی سەر بنێتەوەو کەس پێی نەزانێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە نالی ناوبانگی بڵاوبۆوە بە وڵاتانی ئەورووپاش، ئەویش لە ڕێگای ڕۆژهەڵات ناسەکانەوە، بۆ نمونە ڕۆژهەڵاتناس خۆدزکو لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەمداو لەساڵی ١٨٥٢ز چاوی بە ئەحمەد خان ناوێك کەوتووە، خەڵکی سلێمانی بووەو لە ئەستەمبولەوە چووە بۆ ئەوروپا، خۆدزکو هەواڵی شاعیریەتی نالی لەو (ئەحمەد خان)ـە بیستووەو گویا دۆستیشی بووە(٤). تاکو ئێستا سەرچاوەیەکی لەوە باشترمان لەبەردەستدا نیە کە نالی هەتا ساڵی (١٨٧١-١٨٧٢) ز لە ژیاندا بووە، ئەویش لە سەرقسەی مەلا عەبدوڵای جەلی زادە (باوکی جەنابی مەلای گەورەی کۆیە) گێڕاوەتەوە دیارە قسەکەشی جێگای متمانەیە کەوا لە ساڵی (١٨٧١-١٨٧٢) زدا نالی لە مەکە دیوەو، دیویشیە زۆر پیر بووەو ڕەنگە لە هەشتا ساڵیدا بووبێ هەندێك لە شعرەکانی (نالی) یش ئەم قسەیەی مەلاعەبدوڵای جەلی زادە بەهێز دەکەن وەك دەڵێت:

موویی سپی کردم بە شوشتنی ئاوی عەینی شۆرە شەط
شۆرە شەط یەعنی کە تێدا خودبەخود قەل بوو بە بەط
هەڵگرا، وەك مۆمی کافووری بە شەودا، مووبەمووم
وا سیاهی ڕوو بخوێنم نوقطە بە نوقطە خە ط بە خەط

دیوانی نالی ل ٢٤٢

نالی دامەزرێنەری قوتابخانەی شیعری بابانە، ئەو ڕۆژگارەی نالی لە ژیاندا بووە لە شاری سولیمانی، سەردەمی فەرمانڕەوایی بابانەکان بووە، لێکۆڵەرەوانی شیعری لەو باوەڕەدان کە پاش هاتنی ئایینی ئیسلام تاکو ئیمڕۆ هیچ سەردەمێك وەكو سەردەمی بابانەکان کوردستان پێشکەوتنو بوژانەوەی ئەدەبی بە چاوی خۆی نەبینیووە(٥)، دیارە

ئەم پێشکەوتنەش بە هۆی میرو پاشاکانی بابانیەکانەوە بووە کە زەمینەیەکی لەباریان دروست کردبوو بۆ تەقاندنەوەی شیعری شاعیرانی وەکو نالیو سالمو کوردی.

نالی هەروەکو منداڵانی سەردەمەکەی خۆی دەچێتە حوجرەی مزگەوتەکان، گەلێك لەناوچەکانی کوردستان وەکو سلێمانیو قەرەداغو کوردستانی ڕۆژهەڵات دەگەڕێت و، فێری قورئانو زانستەکانی شەرعی دەبێتو وە دەبێتە مەلا.

نالی لە کاتی خوێندنی فەقێیاتیدا دەکەوێتە بەر کاریگەری ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی هەروەها لە شیعرەکانیدا کاریگەری قورئانو فەرموودەو ئەدەبیو کەلتوری ئیسلامی لە شیعرەکانیدا رەنگی داوەتەوە.

ئەوەتا نالی باس لە حۆریەکانی بەهەشت دەکا، کە مرۆڤی موسلمان لە دونیادا بەو ئۆمیدە دەژی کە لە بەهەشتدا بەو حۆریانە بگەن هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت دەربارەی ئەو حۆریانە (حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ) (الرحمن- ٧٢)

(نالی)یش دەڵێت تۆ حۆریت جێگات بەهەشتە چی دەکەی لێرە؟ وەرە نێو جەنەتی چاوەکانم کە بە فرمێسکی چاوەکانم بۆ باغو گوڵزار تۆ کە حۆریت، وەرە نێو جەننەتی دیدەم. چ دەکەی لەم دڵەی پڕ شەرەرو سینەی سۆزانمدا؟ نالی ل ٩١

(ئەزەل) واتە شتێك سەرەتای نەبێت، هەر شتێکیش سەرەتای نەبێت کۆتایشی نیە، کەواتە بە پێیە خوای گەورە ئەزەلیە، ئادەمیزادیش لە ڕۆژی ئەزەلدا پەیمانی بەخوای داوەکەئەودرووست کەریەتی، بەڵام ئیمڕۆ لەو پەیمانەی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە (وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا) (الأعراف-١٧٢)

بەندە ئەزەل بە خە ططی خۆی قابیلی قیسمەتی بووە
ئێستە بە ئیقتضای عەمەل جێگەی خۆی طەلەب دەکا

بەکارهێنانی داری (سیواك) یەکێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) (السواك مطهرة للفم ومرضاة للرب) موسڵمانیش بۆ زیندوکردنەوەی ئەو سوونەتە بەکاری

دەهێنن بۆ خاوێن کردنەوەی دەمو ددان بە تایبەتی لە کاتی نوێژکردندا (نالی)یش دەڵێت:

داری ئیراكو داری هیند هەردوو کە عودە ئسمیان
هەمدەمی سوونەتە ئەوەم مەیلی ئەبولەهەب دەکا

چیرۆکی حەزرەتی سولەیمانو بەلقیسی شاژنی شاری سەبەء پایتەختی یەمەن، لە قورئاندا هاتووە، کاتێك پەپوسلێمانە بەسەرهاتی بەلقیسو قەومەکەی دەگێڕێتەوە بۆ حەزرەتی سولیمان، کە نەتەوەیەکن سوجدە بۆ ڕۆژ دەبەن(٦)، (وَجَدْتُهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِنْ دُونِ اللَّهِ) (النمل- ٢٤) حەزرەتی سولیمانیش داوای گواستنەوەی عەرشی بەلقیس دەکات، یەکێك لە پیاو چاکان کە زانستو زانیاری لە نهێنیەکانی هەبوو وتی من بۆت دەهێنم بە چاوتروکاندنێك (قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنْ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ) (النمل- ٤٠) نالی شاعیرسودی لەم چیرۆکە قورئانیە وەرگرتوە بۆیە خۆی چواندووە بە پەپوسلێمانە، حەزرەتی سلیمان بە سلیمان پاشای بابانو ئەحمەد پاشای کوڕی بە ئاصەفی کوڕی بەرخیا کە وەزیری حەزرەتی سلیمان بووە

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە، یەقین
خۆی کە دامێن گیری شاهی ئاصەف ثانی دەکا        ل ١٠٥

جا پاش ئەوەی عەرشی بەلقیسی گواستەوە سوپاسی خوای لەسەر کرد (قالَ هذا مِنْ فَضلِ رَبّي)، شاعیریش هەردەم سوپاس گوزاری خوا دەکا کە سولەیمان پاشا چاکەی بەرامبەری کردووە، لە هەموو شوێنێك ئەو باسی پیاوەتی ئەم پیاوە دەکەم هەروەك خوا دەفەرموێت (وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ)(الضحى- ١١).

ئەو کەسە تەحدیثی نیعمەتی بێمورادو مەطلەبی
میثلی (نالی) ئیمتثالی ئەمری یەزدانی دەکا        ل ١٠٥

نالی وەکو موسڵمانێکی خاوەن عەقیدە بڕوای وایە هیچ کارو کردەویەك بێ پشتیوانیو یارمەتی خوا پێك نایەت، یاخود هەر کارێك بکەی دەبێت بەناوی خوا دەست پێ بکەیت ئەگینا ئەوکارە بەرەکەتی تیا ناکەوێت هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) "کل امر ذی بال لم یبدأ فیه باسم الله فهو ابتر" خوای گەورە خاوەن ڕەحمەتێکی زۆرە بەرامبەر بە گیانداران ، وە ئەگەر بیەوێت ڕەحمەتی خۆی ببارێنێت بەسەر بەردیشدا گەورەو پیرۆزی دەکات هەروەکو ئەو بەردە ڕەشەی نێو دیواری کەعبە، کەبەردێکە خوای گەورە پیرۆزی کردووەو پێغەمبەر (ﷺ) ماچی کردووە:

بەو ڕەحمەتە عامەت کە دەکا سەنگی سییەهـ زەڕ

لەم قەلبە کە وەك بەردە، ڕەشە (رُشَّ رشاشا)

خوای گەورە خاوەن دەسەڵاتە هیچ شتێکیش بە بێ فەرمانی خوا نابێت گەر حەز بکات دەیکات گەر حەزیش نەکا نابێت: (يَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (ال عمران- ١٢٦).

هەروەها (هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ) (ال عمران- ٦)

نالی شاعیریش لەم ڕاستیە دڵنیایە بۆیە دەڵێت:

لا حول ولا حول ولا قوة الا

بالله، له القدرة، والکائن حاشا ل ٧٨

فەجری صادقو فەجری کاذب دوو زاراوەی شەرعین، فەجری کاذب هێشتا شەو ماوە، بەڵام فەجری صادق بە مانای شەو نەماوەو بەرەبەیانەو کاتی هەستانە بۆ نوێژو بانگدان، بۆیە نالی دەڵێت ئەو بولبولەی هێشتا شەو ماوە دەستی کردووە بە خوێندن بەنیازی بەیانی بەڵام لە شەو تاریك هیچی تر نیە:

لە ئەشکەنجەی شکەنجی زولفی ئەو بێ وەعدە مورغی دڵ

دەناڵێنی وەکو بولبول لە حوبی کاذیبی شەودا ل ٨٨

حەرەمی مەکە شوێنێکی پیرۆزە ڕاوکـردن‌و کوشـتنی تیـادا حەرامـە، بۆیـە کـەس دەست درێژ ناکات بۆ هیچ گیانلەبەرێك لەناو حەرەمدا (يَاأَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـوا لاَ تَقْتُلُـوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ) (المائدة-٩٥).

هەروەها نالی باسی لە شاری ئیرەم دەکا کە (شەداد) چەند کۆشك‌و باڵەخانەی گەورەی تێدا درووست کردبوو (إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلاَدِ) (الفجر-٨) .

گـــەر بێتە دەرێ سـەروی رەوانی لە ئیرەمدا

وەرە نەبیە، دەرێ ئاهوی چینی لە حەرەمــدا

بە پێی فەرموودەی قورئانی پیرۆز، هەر مرۆڤێك دوو فریـشتەی لـە سەرشـانە لـە کارو کردەوەکانی مرۆڤ تۆمار دەکەن یەکێکیان هی خراپەو ئەوی تریان هی باشە بەڵام بەزەیی خوای گەورە کاتێك مرۆڤ کردەوەی خراپ دەکا، فریشتەکە یەکـسەر نایەنووسـی بەڵکو ئەو مرۆڤە پەشیمان ببێتەوە، بەڵام هی چاکە یەکـسەر دەنوسـێ بـەو دەفتـەری کردەوانەش مرۆڤ دەچێتە بەهەشت یاخود دۆزەخ (إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنْ الْيَمِينِ وَعَـنْ الشِّمَالِ قَعِيدٌ) (ق- ١٧).

نالی دەڵێت:

کـاتبی خێـرو شـەڕی عوششــاقە، بۆ وەصـڵ‌و فیراق

لوطف و قەهری هەر بەجارێ سەیری دوو دەفتەر دەکا    ل١١٠

لە رۆژی قیامەت‌و زیندو بونەوە هیچ کەسێك فریای هـیچ کەسـێکی تـر ناکـەوێت هەموو کەسووکار لە دەست یەکتری ڕادەکەن (يَـوْمَ يَفِـرُّ الْمَـرْءُ مِـنْ أَخِيـهِ وَأُمِّـهِ وَأَبِيـهِ وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ) (عبس ٣٦).

نالی شاعیریش ئەوکاتەی تووشی جیابوونەوە دەبێت وەکو ئەوەیە لەناو (هاویە) بێت کە شوێنێکە لەناو دۆزەخ، بۆیە دەستەو دامێنت دەبم بۆ ساتێکیش لێم جیا نەبیەوە.

مەحشەرە هاوییەی هەوڵی فیراق
دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی قیا ل١٢٦

نالی لە تاو دووری لە حاڵی حەلوەلادایە نە ئەوتا ژیانە ژیانی نە مردنیشی مردنە کەبە جارێك هەناسەی ببڕێ کۆتای بە ژیانی بێت، لێرەدا خۆی وەکو ئەهلی دۆزەخ لێکردووە کەلەناو ئاگردا لە ژیانێکی گەلێك ناخۆشدان، هەرگیز نامرن بۆ ئەوەی لە کۆڵ ئەو ئازارە ببنەوە (ثُمَّ لاَ يَمُوتُ فِيهَا وَلاَ يَحْيَا) (الاعلى ١٣).

دوور لە تۆ ئیدی مەپرسە، قوربان
حاڵی نالی کە نەمردو نە ژیا

خوای گەورە گفتی بە بەهەشتیەکان داوە کە حۆری لە بەهەشتدا لە چاوەڕێاندایە چەندی ئارەزوی لێ بێت تەماشایان دەکەن، جا بۆیە دەبێت سوقی تەماعی ئەو حۆریانە بکات کارو کردەوەی چاك بکات بۆ ئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا دەستی بکەوێت (فیهن قاصرات الطرف لم یطمثهن انس ولا جان) (الرحمن ٥٦).

صوفی مەستووری ڕوت‌و موفلیسی خستە طەمەع
سەیری خاڵی بێ حساب‌و ماچی لەعلی بێ بەها

لە ڕووداوی ئیفك بوختانێکی گەورە دەرهەق بە جەزرەتی عائشەی دایکی موسڵمانان کراوە، بەڵام بۆ سەلماندنی پاك‌و خاوێنی حەزرەتی عائشە بەچەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە باسی خاوێنی دەکات، کەچی سەرە ڕای ئەوەش شیعە

مەزهەب هەر سوورن لەسەر ئەوەی کە قسەی ناشرین دەکەن بەرامبەر دایکی موسڵمانان، کە هەرگیز ئەم قسانە لە گەورەیی ئەودا ناوەشێتەوە، (لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ) (النور-١٢).

عاجز مەبە هەرگیز لە درۆو ئیفکی حەسوودان

دونیایە، دەبێ سەگ بووەڕێ، شیعە بکا سەب ل١٢٤

قارون دەوڵەمەندێکی جوولەکە بووە لە سەردەمی حەزرەتی موسادا ژیاوە گەلێك لە خۆی بای بوو بە ماڵو سامانی خۆیەوە دەنازی تەنانەت کلیلی گەنجینەکانی چەندکەسێك هەڵیان دەگرت، بەڵام خوای گەورە قارو غەزەبی خۆی لێ گرت (إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنْ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ) (القصص-٧٦).

لە سنور دەرچونی قارون خوای گەورە ماڵو سامانەکەی بە ناخی زەویدا بردە خوارەوە (فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الأَرْضَ فَمَا كَانَ) (القصص-٨١).

لێرەدا نالیش ڕۆژو مانگو ئەستێرەی بە موڵکی خوا داناوە، ڕۆژێکیش دادێت ئەمانەش لەناو دەبات وەکو موڵکی قارون

قارونە فەلەك، موستەحەقی گرتنو خەسەفە

زیو زەری شەمسو قەمەرە، دیرهەمی کەوکەب ل١٢٥

چیرۆکی حەزرەتی یوسف پێغەمبەر لەگەڵ زولیخا کە دەیەوێت دەست درێژی بکاتە سەر حەزرەتی یوسف، پاش ئاشکرا بوونی خیانەتەکەی زولەیخایان بانگ کرد، ئەویش بۆ ئەوەی پاکانەی خۆی بکات کۆمەڵێك ئافرەتی داوەت کرد، هەریەکەی چەقۆیەکی دایە دەستیانو پاشان بانگی حەزرەتی یوسفی کرد، کاتێك ئافرەتەکان (یوسف) یان دیت سەریان سوڕما گوتیان (فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا

بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ) (یوسف-٣١) (نالی)یش بۆ سوود وەرگرتن لەبەسەر هاتـە دلدارەکەی خۆی واپیشان دەدات کە هەر کەسێك دڵدارەکەی ئەبینێت دەڵێت:

حاشا ئەوە ئادەمیزاد نییە بەڵکو فریشـــتەیە

هەرچی مەحبوبم دەبینێ واتە حەییور دەیگرێ

سوێن دەخوا بە خوا دەڵێ"باللە ما هذا بشر" ل٢٠٣

کاتێك نالی دەکەوێتە ساڵەوە مووی سپی دەبێت، کە ئاماژەیە بۆ نزیـك بوونـەوەی لە مردن، چوونکە نالی چاك ئەوە دەزانێت (کل نفس ذائقـة الموت) دیـارە نـالیش لـە نەوەی ئادەمەو دەبێت ئەم دەردە بچێژێت چوونکە تەنها خوای گـەورە نـەمرە ئـەگینا ئەوانی تر هەموو دەفەوتێن خوای گەورە دەفەرموێت (كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ) (الرحمن- ٢٧).

سپی نەزیرە هەموو موو لە سیڕڕی (وجە) لەسەر

مونـەووەرە، لـە طـەرەف نوورەوە بووە بە نەزیـــر ل ٢٠٨

نالی تەمەنی مرۆڤی بە مانگ چواندووە کاتێك مرۆڤ بەرەو تەمەنی پـیری دەڕوات کورِ دەبێتەوە، مانگیش کاتێك لە چواردە شەو یەوە بەرەو کەم بونـەوە دەچـێت تـاکو هیچ نامێنێت خوای گەورەش لە قورئاندا دەفەرموێت (ومن نعمره ننکسه فـی الخلـق افلا یعقلون) یس ٦٨

مرووری نەکسە کە عەکسی قەمەر دەکا بە ڕەمەق

دو بۆلی نیکسە دەگێری کە عەکسی ڕیش بە شـــیر ل ٢٠٩

نالی لە غوربەتی دووری ئاوارەیدا، سۆزی خۆی بـۆ شـاری سـلێمانی دەر دەبڕێـت، پرسیار دەکاو دەڵێت ئایا ئێستا ماوەی ئەوەم هەیە یاخود زەمینە لـەبارە بگەڕێمـەوە شارەکەی خۆم؟ یاخود چاوەڕێ بکەم هەتا ڕۆژی قیامەت دیت نەفخی صور لێ دەدرێت هەموو کـەس زینـدوو دەبێتـەوە بـەرەو مەیـدانی حەشـر دەڕۆن لەوێنـدەر بەیـەکتری

شادببنەوە (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ) (الزمر- ٦٨).

ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە

یا مەصلەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صور؟ ل ١٩٧

نالی دەڵێت صوفیو پیاوانی ئاینی، خۆیان لە پەنا پەردەی ئایین شاردۆتەوە گوایە پیاوی باشو لەخواترسن، بەڵام پیاوی خواناس بەکردەوەی باش بەدیار دەکەوێت نەك بەوەرەقی دیدە کە ئەو کاغەزەی دەمو چاوی پێدادەپۆشرێ وەرەق گەر مەبەستی ئەو گەڵایەی بەهەشت بێت کە پاش ئەوەی ئادەمو حەوا داری گەنمیان خوارد عەورەتیان بەدیارکەوتو بەم وەرەقە خۆیان داپۆشت (فَدَلاَّهُمَا بِغُرُور فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ) (الاعراف ٢٢)، یاخود مەبەست لە وەرەق ئەو پارە زیوەی اصحاب الكهف (فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ) (الكهف ١٩)، وەکو ماموستا عبدالکریمی مدرس دەفەرموێت، ئەوا لای ئێمە گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە نالی کەوتوەتە بەر کاریگەری قورئان جا چ مەبەست وەرەقی بەهەشت بێت یاخود پارەی زیوی سەردەمی یارانی ئەشکەوت:

صوفییان هاتنە مەجلیس وەرەقی دیدە بشۆن

لە کن ئەو دێمیە وشکانە لە دەریا نییە باس ل ٢٣٤

نالی تووشی داوای خۆشەویستی بووە، ئەوەتا ڕوو لە دڵبەرەکەی دەکات دەڵێت مەحاڵە کەسێك سۆزو خۆشەویستی تۆی لەدڵا بێتو بتوانێت خۆی ڕاگرێ، چونکە خوای گەورەش داواکارێك لەکەس ناکات کە لە توانای نەبێت (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَ وُسْعَهَا لَهَا) (البقرة- ٢٨٦)

قوربان مەحاڵە پێکەوە بن صەبرو ئیشتیاق

خاریج لە نەصصی ئایەیە تەکلیفی (الایطاق) ل ٢٤٨

شاعیر باس لەسەرەتای دروست بوونی مرۆڤ دەکات، کەسەرەتا دلۆپە ئاوێکە، هەروەکو چۆن لەسەرەتای بەهار گەلای دارو درەخت دەپشکوێ یاخود لەوەرزی بەهار کانی دەزیتو ئاو زۆر دەبێت، دیسان بە هۆی ئەو ئاوەش ئافرەت سکی دەبێ: (فَلْيَنظُرْ الإنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ) (الطارق: ٦-٧).

کانی دەزێن بەئاو و، درەخت ئاوسن بەبا

شاییی بەهارە، بولبولە داماوو غونچە بوك ل٢٥٨

نالی هێندە نزیك بۆتەوە لە خۆشەویستەکەی بەقەد پێوانەی دوو کەوان، بەڵام لەگەڵ ئەم نزیکیەش هێندە دوورە دەستی نایگاتێ دەبێت نالی دووریەکەی بە جەستەییبێتو نزیکیەکەشی لەدڵ بێت کە هەردەم لایەتی، لێرەدا نالی پەنای بۆ ئەو ئایەتە بردووە کە خوا دەفەرموێت:

(ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى) (النجم ٨-٩)

لە قوربی (قاب قوسین)ی دو ئەبرۆت

منی (ادنی) چ دوورو دەربەدەر مام ل ٢٦٢

نالی ئومێدێکی زۆری بەوە هەیە کە لە ژێر ئاڵای پێغەمبەر(ﷺ) حەشر بکرێتو بە عەفوی ئەو پێغەمبەرە کە ڕەحمەتە بۆ هەموو دونیا (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ) (الانبیاء ١٠٧)، کەواتە ئەگەر چی نالی گوناهبارە بەڵام لە کۆتاییدا هەردەچێتە بەهەشت، نالی خۆی وەکو سوالکەرێك داناوە دەچێتە بەر دەرگای پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ئاشکراشە پێغەمبەر هیچ کەسێکی بەدەست بەتالی نەگەڕاندۆتەوە (وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ) (الذاریات ١٩)

لە خاکی دەری ڕەحمەتی بێ زەحمەتە، ((نالی))

فیردەوسە مەئالی

حاشـــا کە لەمێدا ببمە ســائیلی مەحروم

هەرچـــەندە لە عوصاتم                                    ل ٢٧٠

نالی کەسێکە شوکرانەی خوای گەورە دەکات لەسەر ئەو نیعمەتانەی کـە لەگەلیـدا کراوە ئەوەتا وەکو مرۆڤێکی بەئەمەل باسی ئەوە دەکات کە هەر لـە تـۆقی سـەریەوە تاکو پەنجەکانی غەرقی رەحمەت بووە، هەندێکیش لەو نعمەتانەی باس کردووە وەکو نە پیرێکی ددان کەوتووە نە شەلە نـە کۆسـەیە، بەهـەرحاڵ گـەربێتو نیعمەتـەکانی خـوا بژمێرین ناژمێردرێت (وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا) (ابراهیم ٢٤).

عاجیــزی شوکری تەمامـی نیعەمم ســـەرتاپا

کە نەریش بەڵم و، نە کۆسەو، نە کەڵو گۆج و شەلم                ل ٢٩٢

دەفتەری کردوەکانی نالی پڕە لە گوناه، ئەو دەفتەری کە هەموو شتێکی تێدا تۆمار دەکرێت گەورەو بچوك هیچی لەیاد ناکرێت: (مَـالِ هَـذَا الْكِتَـابِ لاَ يُغَـادِرُ صَـغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا) (الکهف ٤٩)، جا کە دەفتەری کردەوەی هێندە رەش بێت بە ئـاوی زەمزەمیش ناشورێتەوە، تەنها بەرەحمی تۆ نەبێت رەحمی تۆش هێندە زۆرە دونیـای پـڕ کردووە چ مەکە بێت یاخود شـوێنێکی تـر (وَرَحْمَتِـي وَسِـعَتْ كُـلَّ شَـيْءٍ) (الاعـراف-١٥٦).

دەفتەری ئەعمـــالی من، بێ قەطرەیێکی ڕەحمـــەت

کەی بەحەد زەمزەم سیاهیی نوقطەیێکی لێ دەشوم؟                ل ٣٠٠

لەلای نالی وەعد زۆر گرنگە، مرۆڤـ دەبێت عەهدو وەفای هەبێت، چونکە عـەهـدو پەیمان لە ئەستۆی ئەو کەسەدایە کە وەعدەکەی داوە، هـەرگیز ئـەو عـەهـدە لەسـەری ناچێت تاکو جێبەجێ دەکات (وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولا) (الاسراء ٢٤).

وەفای عەهدە لەمن ڕۆح و، لە تۆ ماچ

چیە چارەی ئەمانەت غەیری تەسـلیم                ل ٣١٢

مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەز بەمانەوە دەکات هەرچەندە بژی وا هەست دەکات ماوەیەکی کەم ژیاوە وەکو حەزرەتی نوح سەلامی خوای لێ بێت کە تەنها ٩٥٠ ساڵ پێغەمبەرایەتی کردووە ئینجا دەربارەی ژیانی خۆی وتی دونیا خانوێکە دوو دەرگای هەیە لە یەکێکیان چوومە ژوورەوەو لەوی تریان هاتمە دەرەوە، کەواتە تەمەن چەند درێژ بێت مرۆڤ ناتوانێت هەموو ئاواتەکانی خۆی بهێنێتەدی کەواتە چەند بژی هێشتا کەمە چونکە ئاواتەکانی نوێ دەبنەوە (یشیب ابن ادمو یشب فیه خصلتان : الحرصو طول الامل) جا نالی دەڵێت هەرچەند وەکو خضر (خدری زیندە) کە باوە ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە تاکو قیامەت نامرێ کەواتە گەر تەمەنی خدریشت هەبێت مادام هیوات زۆرە، تەمەن کەم دەبێت:

هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بوو

چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو　　ل٣٦٧

نالی روومەتی بە بەهەشت چواندووە، خالی سەرگۆناشی بەو دەنکە گەنمەی بەهەشت، کە دایکە حەواو باوکە ئادەم لە بەهەشت خواردیان و، بووە هۆی دەرکردنی هەردووکیان لە بەهەشت، جا هەرکەسێك دەست بۆ خاڵەکە ببات دەری دەکات لە بەهەشتی خۆی واتە مەحرومی دەکات لە دیتنی روومەتی خۆی.(وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ)، (الاعراف- ٢٢)

خاڵت چییە؟ دانەی گەنمی جەننەتی ڕوونە

چاوت چییە؟ فیتنەی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ　　ل ٣٨٦

نالی لە بەیتە شیعرێك ئاماژە بە دوو ڕووداوی گرنگی سەردەمی موسا دەکات یەکێکیان ئەوە کە داوای دیتنی خوای گەورەی کرد، خوای گەورەش نووری خۆی لە کێوی طور دا ئیتر موسا توانای خۆراگرتنی نەماو لە هۆش خۆی چوو. (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنْ انظُرْ إِلَى

الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ)، (الاعراف ١٤٢).

ڕووداوی دووەم کاتێك فرعەون‌و دارو دەستەکەی بەدوای موسا (سەلامی خوای لێ بێت)، کەوتن رووباری نیل بۆ حەزرەتی موسا شەق بوو، پاشان لەشکری فرعەون بەهەمان شێوە ویستیان بە دوایان بکەون بەڵام رووبارەکە یەکی گرتەوەو فرعەون‌و لەشکرەکەی خنکان:

(وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمْ الْبَحْرَ فَأَنْجَيْنَاكُمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنْتُمْ تَنظُرُونَ)، (البقرة- ٥٠)

به ناری عیشق‌و ئاوی دڵ، جەسەد وەك حەضرەتی موسا

طەریقی بەحری فیرعەون و، ڕەفیقی ئاتەشی طوورە    ل ٢٠٧

حەزرەتی سولەیمان فەرمانیدا هەر باڵندە هەیە کۆیان بکاتەوە، پاش پشکنینی حەزرەتی سولەیمان بۆی دەرکەوت پەپولە سلێمانە دیار نیە: (مَا لِي لاَ أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنْ الْغَائِبِينَ)، (النمل ٢٠).

پاشان پەپولە سلێمانە بیانوی هێنایەوە بە بەلقیس شاژنی یەمەن سەجدە بۆ ڕۆژ دەبەن، خاوەنی عەرشی خۆیەتی، جا یەکێك لە پیاوچاکان گوتی: (قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنْ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ)، (النمل٤٠).

صاحێبی (علم الكتاب)ـە موطریبی هودهود نەفەس

یا سولیمانە لە (اخوان الصفا) ئا صەف صەفە    ل ٤٥٣

نالی لای وایە عەشقی راستەقینە لای ئەوە چونکە ئەو بەدوای رەحەتی لەشدا دەگەڕێت ئەو پەرۆشی بەلێو گەیشتنە هەروەکو چۆن پیاوێکی خواپەرست وێڵ‌و شەیدای گەیشتیتەی بە ئاوی کەوثەر، ئەو ئاوە سپیە وەکو شیر، شیرینە وەکو هەنگوین (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ)، ( الكوثر- ١)

بە نەهری کەوثەرو شیری‌و عەسەل چەند تینوە صوفی

لەبی (نالی) دوچەندان بۆ لەبانی لەعلی موشتاقە    ل ٤٥٧

شاری مەکە مەڵبەندی سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام کە پێغەمبەر(ﷺ) تێدا لە دایك بووەو هەرلەوێش سروشتی بۆ هاتووە ئەرکەکانی ئاینی ئیسلامی تێدا چەسپاوە، جگە لەوەش یەکەمین خانووی خواپەرستی لە مەکە دروست کراوە لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیم بۆیە ئەم شوێنە هێندە پیرۆزە (وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنْ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)، (البقره ١٢٧)

چ مەککە؟ دارو بەردی قاعیدەی ئەرکانی ئیسلامە
چ طەیبە؟ ماء و خاکی مائیـــدەی ئەنواری ئیمـانە ل ٤٨٥

بەجێهێشتنی حەزرەتی ئیسماعیلو دایکـی لـە شـارێکی وەکـو مەکـە کـە هـیچ خواردنو خواردنەوەی لێ نەبوو، جگە لەوەش شـوێنێکی ئـەمین نـەبوو چـونکە هـیچ ئاوەدانیەکی لێ نەبوو، کەواتە بـە کـەڵکی ئـەوە نـەدەهات ئـەم دایـكو کـوڕە تێـدا بمێننەوە، بەڵام حەزرەتی ئیبراهیم لە خوا پارایەوە:

(وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنْ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآَخِرِ)، (البقرة- ١٢٦).

پەپولە هێنـدە عەشـقی چـراو ڕوناکیـە هـەر بەدەوریـدا دەسـوڕێتەوە لێـی نزیـك دەبێتەوە، تاکو باڵەکانی لە ئاگرەکە ئەداو ئەسـوتێ، مرۆڤـی موسـلمانیش بەدەسـتی خۆی نیە لەدوری چەند ڕۆژە ڕێگاوە دێتە شاری مەکە عەشـقو خۆشەویسـتی کەعبـە وای لێ دەکات هەردەم بەدەوریدا بـسوڕێتەوەو تەسـبیحاتی خـوای گـەورە بکـات ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ)، (الحج- ٢٩).

چ جەذبە؟ جەذبەیی ضەوئە لە قنیدیلی حەرەمدا، وا
دەبێ ئینسـان لە طەوافیدا بسوتێ میثلی پەروانــە ل ٥٠١

پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی وا بەرێزو بەجێو ڕێگایەو خاوەنی عیزەتو عەزمە لە هەردوو جیهاندا ڕێزی لێ گیراوە، جگە لەوەش لەلایەن خوای گەورەوە دەعوەت کراوە بۆ ئاسمان: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا)، (الاسراء- ١)

چ میوانێکە؟ صاحێب جێو جاەو عیززەتو عەزمە

لە دوو عالەم طوفەیلی دەعوەتیو ئەو صاحیبی خوانە ل ٥٠٤

دیسان پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە کراوە بۆ ئومەت بە مزگێنیدەر بە بەهەشتو ترسێنەر بە ئاگری دۆزەخ (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا(٤٥)وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا)، (الاحزاب: ٤٥-٤٦)

موحەممەد، ئەحمەدی مورسەل، مونیری مینبەرو مەحفەل

بەشیری ئاخیرو ئەووەل، نەذیری خوێش* و بێگانە ل ٥٠٤

لە سەردەمی نەزانین واتە پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) خەلکی لە نەفامی دەژیا وەکو مردوو وابوون بەلام پاش ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هات هۆشی وەبەر خەلکەکەدا هێنایەوە، وەکو بلێ خەلکی زیندوو بۆوە وەکو لێدانی نەفخی صور کە جارێك لێ دەدرێ هەموو خەلکی ئەمرێت، جاری دووەم هەموو خەلکی زیندوو دەبێتەوە (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا)، (الكهف ٩٩)

لە نەفخی صوورو نەشری بەعثەتی دینی حەق ئیحیا بوو

لە قەبری جاهیلیەت هاتەدەر هەرچی موسلمانە ل٥٠٥

بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤایەتی توانی شتی هەقو ناهەق لە یەکتری جیا بکاتەوە وەکو شەو ڕۆژ کە چۆن شەو دادێ ڕۆژ نامێنێ کە ڕۆژیش هات شەو نامێنێ

---

* ئاماژەیە بە ئایەتی (و انذر عشيرتك الاقربين).

ئیتر بەهاتنی ئەو پێغەمبەرەش هەق هاتو ناهەق باری کرد (جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِـلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا)، (الاسراء ٨١).

لەسایەی ئەمرو نەهیی، حەقو باطیل بوو بە دوو فیرقە

بە میثلی فەرقـــی رۆژو شەو کە فاریق نووری ئیمـــانە ٥٠٦

بە لەدایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ) دونیا روناك بۆوە ئەو نوورەی لـە مەکـەوە سـەری هەڵدا هەموو دنیای گرتەوە، لە هەمانکاتیـشدا ئـاگری ئاگرپەرسـتانو تـاقی کیـسرا شەقی برد لە نیشانەی لەناوچوونی بوو:

(النطفت نار المجوس و انشقت ایوان کسرا).

شــەقــاوەت بوو بە دوود داخـــیلی کوورەی ضــەلالەت بوو

ئەمارەت خوسری خوسرەو، کەسری کیسرا، شەققی ئەیوانە ل ٥٠٧

قورئان موعجیزەیە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە، هەروەکو چۆن هـەموو پێغەمبـەرێك موعجیزەی هەیە ئـەو قورئانـە موعجیزەیـە چـونکە کـەس ناتوانێـت یـەك ئایـەتی هاوشێوەی ئەو بهێنێت: (قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُـرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا)، (الاسراء ٨٨).

هەروەها ئایەتی (سبحان الذی) موعجیزەیەکی ترە لەناو موعجیزەی قورئان کە باسی شەوڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات:

لە جوملەی موعجیز ئەندەر موعجیزی: ئەحکامی قورئانە

کە میعراجـــی بوڵەنـــدی ئەوەی ئایـــاتی (ســوبحانە) ل ٥٠٨

حەزرەتی یەعقوب لەتاو دووری یوسفی کوڕی چاوەکانی تاریك بوون ئـاوی رەشـیان تیاکەوت، کوێر بوون کاتێك کراسەکەی یوسفیان بۆ هێنـاو بەسەر چاویان دادا روناکی بۆ چاوەکانی گەرایەوە(فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا)(یوسف ٩٦)، ئاسمانیش بەشەو تاریك بوو وەکــو بڵێ چاوەکـــانی کوێر بوبێت، بەڵام کاتێـــك

پێغەمبەر(ﷺ) لەشەوی میعراج چووە ئاسمان، ئاسمان روناکی بۆ گەرایەوە.

لە هیجری یوسفی میعراجی، یەعقوبی فەلەك چاوی

نوجـوەی بو سپی، هێشتاکو هەر حەیـران‌و سەهرانە

پێغەمبەر(ﷺ) لەشەوی میعراج شەرەفمەند بوو بە نزیك بوونەوەی لەخوای گـەورەو زانینی رازو نهێنیەکانی بونەوەر: (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَـى فَـأَوْحَى إِلَـى عَبْـدِهِ مَـا أَوْحَى) (النجم ٩-١٠).

موشەڕڕەف بوو بە تەختی عـەرش‌و تاجی قوربی (عـندالله)

بە هەرچی دەرجـــی (او ادنی)و (مـاوحی)ی قورئـــانە     ل ٥١٥

نالی مەبەستی ئەوە نیە بەچەند بەیتێکی کوردانـە باسـی پێغەمبـەر(ﷺ) بکـات، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) گەلێك لەوە بەرزترە من ستایشی بکـەم چـونکە خـوای گـەورە دەربارەی دەفەرموێت: (وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) هـەروەها حـەزرەتی عائـشە دایکـی موسڵمانان دەربارەی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) دەفەرموێت (کان خلقە القران) کەواتە مـن چ بڵێم دەربارەی هەرناگەتە ئەو پێناسەیەی خواو حەزرەتی عائشە:

ئەگەرچی کوردی دووری شارەزووری قەسەوتم، ئەمما

وەسیلەم طە یبەوو حیلمی شەفیع‌و فەضلی مەنناتە     ل ٥١٧

ئەگەر چی نالی گوناهی گەلێك زۆرەو دەفتەری کردەوەی رەش بووتەوە بە کـردەوەی خراپە، بەڵام نالی وا لەبەر دەرگای رەحمەتی خوادایەو ئومێدی بە عــەفوی خـوا زۆرە، چونکە خوای گەورە خاوەن عـەفوی زۆرە یەکێکیش لە ناوەکانی خوای گـەورە (عفـو)ە (إِنَّ رَحْمَةَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنْ الْمُحْسِنِينَ) (النساء- ٥٦)

دەری رەحمەت کەوا بەحری موحیطی عـاصییە "نالی"

تیا جان وتــــەن ئوفتادەی ســـەیلی عیصـــیانە     ل٥٢٠

وەرزی بەهار واتە بوژاندنەوەی زەوی گیاوگوڵ دەردەکات زیندوو دەبێتەوە هـەروەکو چوون نەفخی صور لـێ‌دەدرێ هەموو مرۆڤ لە گۆڕکانیـان زینـدو دەبنـەوە (وَنُفِـخَ فِـي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُـمَّ نُفِـخَ فِيـهِ أُخْـرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ) (الزمر ٦٨).

لەم فەیض نوورە هـەرچی کەوا نـــارە مردووە

بەم نەفخی صورە هەرچی کەوا خاکە ژیایــەوە ل٥٥٠

موسڵمان کاتێك کە دەچێتە حەج‌و پاش ئیحرام بەستن دوعـای (لبیـك اللـهم لبیـك لبیك لاشریك لك لبیك ان الحمدو النعمه لك والملك لاشریك لك) دەکا.نالی پـەنای بـۆ ئەو ئایەتە بردووە کەخوا دەفەرموێت (صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللَّهِ صِبْغَةً) (البقـره ١٣٨)، هەروەها ئایەتی (ید الله فوق ایدهم)

بەوەقتی تەلبیە مەستی شوهوودی (صبغة الله) بێ

بەگاهی تەروییـــە سیرری (ید الله) دەسـتیاری بێ

صەفاو مەروە دوو بەرزایین روکنی حەجە کە حاجی طەواف لە نێوانیان دەکات، نالی دەڵێت بە بە بەرەکەتی صەفاو مەروە رەحمەت وەکو ئاوبرژێت‌و ببارێت، خوای گەورە باسی صەفاومەروە دەکات‌و دەفەرموێت: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) (البقره ١٥٨).

فەیوضاتی (صفا) وو (مەروە) هەروەك ناودان دەم دەم

لە یەنبوغی دڵـی پڕ زەمزەمەی میزانـــی جـاری بێ ل ٦٣٥

لە ساڵی ٥٧١ عـیسایی پاشای حەبەشە بەخۆی‌و کۆمەڵێك فیل هاتن کەعبـە تێـك بدەن، کە ئەمە مێژوویەکی ئیسلامیە خوای گەورەش لە قورئاندا ئیسپاتی دەکـا (أَلَـمْ تَرَى كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ) (الفیل- ١)، بۆیـە نـالی مـووی رەش دەم‌و چـاو دەشوبهێنێ بە نەجاشی حەبەشی کە خەریکە ئەو موە رەشانە دەم‌و چاو داگیر دەکات،

بەڵام جیاوازی لەوەدایە مووی ڕەش واتە ڕیش‌و سمێڵ دەتوانێت رووی پیاو داگیر بکات، بەڵام نەجاشی حەبەشی نەیتوانی شاری مەکە داگیر بکات‌و کەعبە تێك بدات.

صەد حەیفی لەبۆ کەعبەی حوسنت کە بەسەریا

نەجاشی‌یی خەط هاتووە نێزیکە خورووجی          ل ٦٤٠

نالی لە ئیحرام دایە، کاتێکیش مرۆڤی موسلمان لە ئیحرام دا بێت نابێت راوی ئاژەڵ‌و پەلەوەر باڵندە بکات، خۆشەویستەکەی نالی لە حەرەمی مەکەدایە ناتوانێت قسەی نارێکی لەگەڵدا بکات، کەواتە هۆی چیە داواکار (مودەعی) هەروەکو سەگ دەستی کردووە بەوەڕین (لاَ تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ) (المائدة).

من لە ئیحرامی ئەدەبدام‌و ئەتۆش صەیدی حەرەم

موددەعی، هەروەکو سەگ، بۆچی بە ئێمە دەوەڕێ          ل ٦٥٢

ساقی گەر تۆ دەتەوێت بچیتە مەکە طەوافی ماڵی خوابکەی وەرە نێو دڵم چونکە تۆ دەتوانیت لەناو دڵم شوێنی خۆت بکەیتەوە نالی شاعیر ئاماژە بەدوو ئایەتی قورئانی دەکا (إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا) (ال عمران ٩٦)، کە کونترین ماڵی خوایە بۆ خواپەرستی دروست کرابێ هەروەها ئایەتی دووەم طەوافی کرد لە دەوری خانووە کۆنەکە (ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ) (الحج ٢٩).

ساقی! وەرە مەیخانەیی دڵ کۆنە رەحیقی

گەر مایلی طەوفی حەرەم‌و بەیتی عەتیقی          ل ٦٥٥

نالی لەوەرزی بەهاردایە دەشت‌و دەر بەهۆی مانگی بەهارەوە سەوز دەچێتەوە، کەواتە نالی تۆش هەروەکو حەزرەتی موسا کاتێك گەیشتە کێوی طور پێی گوترا پێڵاوەکانت داکەنە چونکە لە شوێنێکی پیرۆزی کە کێوی طورە (فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِي الْمُقَدَّسِ طُوًى) (طه ١٢)، هەروەها لەلای کێوی طور بەلێنمان پێدان کە گەزۆ

شەلاقەشمان بۆ باراندن: (يَابَنِي إِسْرَائِيلَ قَدْ أَنجَيْنَاكُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ وَوَاعَدْنَاكُمْ جَانِبَ الطُّورِ الأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمْ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى) (طه ٨٠)،

وادی بووە بە وادەییی پڕ نووری (طور)ی (نار)

(نەعلـین) لەپێ فرێدە ((نالی)) بە (ئەیـمەنی)　　　ل ٦٦٦

پێغەمبەر(ﷺ) تاجی سەری عەرەب‌و عەجەمە، چونکە مرۆڤایەتی ژیـانی بەبـەردا کرایەوە وەکو وەرزی بەهار چۆن ژیان بە بەر زەوی دەداتەوە؟ پێغەمبـەر(ﷺ) کێشەی لەگەڵ جولەکەکانی مەدینە هەبوو، بۆیـە خـۆی حـەزرەتی علـی‌و فاطمـە و حەسـەن‌و حوسـینی لـەژێر عەباکـەی خـۆی دانـا، بۆیـە ئـالی عـەبا مەبەسـت ئـال‌و بـەیتی پێغەمبەرە(ﷺ).

نالی رووله میرزا دەکات دەڵێت بۆخۆت بەزل دەزانی جلـی گرانبـای ئێرانـی لەبـەر دەکەی! ئەی ئەوە نیە پێغەمبەر(ﷺ) جـل‌و بـەرگی سـادەی یەمـەنی وەکـو بـوردەی یەمەنی کردۆتە بەری:

گوتم ئەی قیبلەی قوزە: بۆچی بە تەحریری حەریر

ڕاغیبی لیبسی عەجەم، تاریکی بەرگی یەمەنی

گوتی تـاجی عەرەب و، ئالی عەبا فەرموویـان

عەیبە تەن پەروەری یو نەرمی‌و نـازك بەدەنی　　　ل ٦٧١

خوای گەورە هەموو نهێنیەکانی خۆی شاردۆتەوە، کەسیش نازانێت خوای گـەورە چ جێگاو ڕێگایەکی بۆ پیاوچاکان ئامادە کردووە هەروەکو خوا دەفـەرموێت: (فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (السجدة- ١٧).

بەڵام خۆشترین شت لـەلای ئـەهلی بەهەشـتیەکان ئـەوەی کـە چـاویان پـێ ڕۆشـن دەبێتەوەو دڵیان پێ‌فێنك دەبێت دیتنی خوایە (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ) (القيامة ٢٢-٢٤).

کەواتە ئەو شتە شاراوانە کە خوای گەورە ئامادەی کردوە، (کەشاف)و (بیضاوی)یش ناتوانن ڕوونی بکەنەوە، کە دوو تەفسیری باوەڕپێکراون لە جیهانی ئیسلامدا:

لە قورئانـدا بە (ما افقی لهم) مەکتـــومو مەختـــــومە
بەیان نابێ بە تەفسیری دوصەد (کەششاف)و (بەیضاوی)          ل ٦٨٨

سەرچاوەو پەراوێز:


١- دیداری شیعری کلاسیکی ئیسلام / ئامادەکردنی حمە سعید حمە کـریم / دەزگـای روشـنبیری بلاوکردنەوەی کوردی / بغداد.

٢- دیوانی نالیو فەرهەنگی نالی / د.مارف خەزنەدار، بغداد / ١٩٧٧/ دار الحریە لطباعة.

٣- لە ڕێگای ئەدەبو لە پێناوی (نالی)دا / محمد مەلاکریم / چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد/ بەغدا / ١٩٧٩.

٤- مێژوی ئەدەبی کوردی / د. مارف خەزنەدار / دەزگای ئاراس / هەولێر / بەرگی سێیەم

٥- دیوانی نـالیو لێکولینـەوەو لێکدانـەوەی/ مـەلا عبـدالکریمی مـدرسو فـاتح عبـدالکریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ١٩٧٦.

٦- بەسەرهاتی حەزرەتی سلێمانو بەلقیس لە تەفسیرەکان باس کراوە بە درێژی خوێنەر دەتوانێت تەماشایان بکات.

٧- هۆنراوەکان لە دیوانی (نالی) لێکولینـەوەو لێکدانـەوەی (مـەلا عبـدالکریمی مـدرسو فـاتح عبدالکریم) وەرگیراوە.ئایەتەکانیش لەقورئان وەرگیراوە، هەروەها تەماشای تەفسیری (تفـسیرو بیان مع اسباب النزول للسیوطی / اعداد الـدکتور محمـد حـسن الحمـصو تەفـسیر ئاسـان بـۆ تێگەیشتنی قورئان / نوسینی برهان محمدامین) وەرگیراوە.

# سالم[1]

سالم (١٨٦٩-١٨٠٥) لە سلێمانی لەدایکبووە، خوێندنی لە حوجرەی مزگەوتەکان دەستی پێکردووە، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت، بەردەوام نەبووە لە خوێندن، بنەماڵەی سالم لەگەڵ دروستبوونی شاری سلێمانی هاتوونەتە ئەم شارە، شاعیر ئامۆزای کوردی شاعیرە.

سالم یەکێکە لە سێکوچکەی قوتابخانەی شیعری بابان هاوچەرخی نالیو کوردییە، سالم شیعری لە نالیو کوردی زیاترە، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا (سالم)ی شاعیر وەکو پێویست ئاور لە خۆی شیعرەکانی نەدراوەتەوە، ئەو شیعرانەشی کە کەوتونەتە دەست ئێمە سەرجەمی هۆنراوەکانی سالم نین، بەڵکو بەشێکی کەمیەتی، ئەوەی دەست ئێمەش کەوتووە کەموکوری تێدایە، بەڵام هەرچۆنێك بێت دەبێت کارەکانی کوردی مەریوانیو گیوی موکریانی بەهەند وەربگیری چونکە بەرهەمی سالم لە فەوتان رزگار کراوە، لەلایەکی تریشەوە ئەو سەردەمەی بەرهەمی سالم بەچاپ گەیەنراوە هەر ئەوەندە لە کەرستەی شیعری سالم لەبەردەست بووە.شاعیر گەلێك جار سەردانی ئێرانی کردووە، بەهۆی ئەوەوە خزمانی لە ئێران پەنایان داوەو حەواندویانەتەوە گەرچیش گەلێك لە وڵاتی ئێران بێزاربووە. هەردەم دڵی بۆ وڵاتی بابان لێیداوە، ئەوەتا شاعیر شەرت لەگەڵ دڵدا دەکات، هەرکاتێك لە تارانی پایەتەختی ئێران رزگاری بێت، ئەوا دەشتی (رەی) ببێتە بەهەشتیش بەوێدا تێپەر نابێت:

لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بێ لە تارانا
بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی بە تارانا گوزەر ناکەم

---

١) هۆنراوەکانی لە دیوانی سالم، چاپی دووەم چاپخانەی کوردستان وەرگیراوە ١٩٧٢.

سالمی شاعیر لەسەردەمی بابانەکاندا ژیاوە، هەوای ئازادی سەردەمی بابانەکانی بەچاوی خۆی بینیووە، لەکاتی داگیرکردنی سلێمانیو تێکچونی ئەمارەتی بابان لەلایەن تورکە عوسمانیەکان شاعیر لەم شارەدا بووە، بەچاوی خۆی بینیویەتی کە سوپای داگیرکەر چۆن کەوتبونە وێژەی گیانی ئەو خەڵکە بەستەزمانە کە هیچ ماڵێك نیە جەرگی پارەپارە نەکرابێت، بۆیە خەڵکی هەوای هیچ کەبابێك هەڵنامژن چونکە جەرگی خۆیان سوتاوە بۆنی سوتانی جەرگیان دێت:

ناکەن هەوایی هیچ کەبابێ زەلیلی شەهر
بوریانە بەس لە ناری غەما پارەی جگەر

بۆ نایەن تەماشای گۆرستانی سەیوان بکەن، کە چۆن ئاوەدان بۆتەوە کە بۆتە جێگای هەزارەها کەسی ستەمدیدە، یاخود هەرکەسێکی مردوو خزمو کەسو کاریان دێنە سەرگۆڕەکەی تا وای لێهاتووە ئەم گۆرستانە قەلەبالغی تیا کەوتووە:

(سەیوان) پڕە لە شەخسی ستەمدیدە خوارو ژوور
هەر قەبرێ پڕ غەماتە لە هەرلا دەکەم نەزەر

سالم لە ئاستی هۆنراوە نوسیندا لە ئاستی نالی شاعیردایە، باشترین بەلگەش وەلامەکەی (سالم)ە بۆ نالی، گەر یەکێك بەچاوی بابەتیانەوە سەیری هەردوو سەرچاوەکە بکات، هەروا هەست دەکات یەك کەس ئەو دوو چامەی نوسیووە.

وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد (سالم) لە حوجرەکاندا فێری خوێنەواری بووە، هەر ئەمەشە وای کردووە رۆشنبیریەکەی سالم رۆشنبیریەکی ئاینی بێتو رەهەندی ئاینی لە شعرەکانیدا رەنگبداتەوە.

حەزرەتی موسی موعجیزەی ئەوەی هەبوو هەرکاتێك دارعەسای دەستی فرێدەدا دەبووە ئەژدیهایەکی زۆرگەورە، هەموو ماری سیحربازەکانی فرعەونی لول دەدا هەروەکو چۆن بروسك بە خێرایی دێ ئاگرێکی گەورەی لێ پەیدا دەبێت: (قَالَ أَلْقِهَا

یَامُوسَى فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى قَالَ خُذْهَا وَلاَ تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الأُولَى) (طه: ١٩-٢١).

عصای موسایە سەرنێزی لە ڕەغمی مشتی فرعەونی
بە بەرقی ئاتەش ئەفشانو بەشکلی ئەژدەها پەیدا

لە ڕۆژی مەحشەر هەموو خەڵك کۆدەکرێتەوە، هەرکەس مافی خۆی وەردەگرێ، ئەوانە تاوانبارن لەو ڕۆژەدا شەرمەزار دەبن بەرامبەر خەلکی، جا سالم هێندە طەریقەی گەرمە بە هیچ شێوەیەك ئامادە نیە ئەو ڕێگایە بەردا، تەنها ئەگەر لە ڕۆژی ئەزەلدالە دەفتەری کردەوەکانیدا نوسرابێ:

طەریقی عیشقت ئەر بەردەم خەجاڵەت بم لە مەحشەردا
نەنووسرابم لە پێتا گەر ئەزەل حەڵ بم لە دەفتەردا

من کابرایەکی زۆر لێکراوم ئاهو هەناسەی زۆر لێکراوانیش لە لای خوا ڕەت ناکرێتەوە، جامادام وایە خۆت بپارێزە لەکاتی سەحەرەدا، چونکە ئەو ڕۆژەی من تێدا دەژیم هەروەكو ئەو ڕۆژەی عومەری کوڕی خەتابە، کە دادپەروەری هەبوو دین جێ بەجێ دەکرا:

لە هەناسەی منی مەظڵومی غەریب خۆت بپارێزە لە وەختی سەحەردا
حورمەتی تۆ لە زەمانەی (سالم) هەروەکو دینە لە عەهدی عومەردا

ئاوی کەوثەر خەڵاتی پێغەمبەر(ﷺ) کراوە (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) بەهەشتیەکان لێی دەخۆنەوە جا ئەگەر بێتو پەریەکانی بەهەشت لەو ئاوە بخۆنەوە هێشتا لە جوانیدا ناگەن بە ڕووی تۆ چونکە ڕووی تۆ ڕازاوەتەوە بە خەتو خاڵ:

ئەگەر حۆری لە کەوثەر شوستوشۆی خۆیدا بە تۆ نابێ
بە ئابو ڕەنگو خاڵو خەت چە حاجەت ڕوی زیبا

ئەو کاتەش ڕووی جوانی یوسف بە دیار کەوت، زولیخای ژنی عەزیزی میسر عەشقی جوانی بوو خۆی پێ نەگیرا هەرچی ئابڕووی هەبوو نەیما بۆیە خۆی تەسلیم

کرد، بەڵام ئاواتەکەی لەگەڵ یوسف نەهاتە دی کە یوسف وتی: (قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ) (یوسف ٣٣).

کە شوعلەی طە لعەتی یوسف طلوعی کرد بە چی زانیم
کە عیشق ئەز پەردەی عیصمەت بیرون ئارد زولیخا را

پردی صراط ئەوپردەیە کە هەموو مرۆڤێك دەبێت بەسەریدا تێپەر ببێت، هەیە گەلێك بە خیرای هەیە لەسەرخۆ، وە هەیە ناتوانێت بپەڕێتەوە، کەوا مەجنون چ غەمی ئەوەی هەیە کە چۆن بپەڕێتەوە، چونکە لەوێش مەجنون هەر غەمی لەیلایەتی لەوێش بە ئاهی لەیلاوەیە:

مەجنون غەمی کووا پردی صیراط هەروەکو موویێ
دەیکێشـــی لەویشـــا کەشـــتی طووڕەیـــی لەیلا

نەزۆك ئەو کەسەیە کە منداڵی نابێـت، حـەزرەتی عیـساش بـێ ژنو منـداڵ بـووە هەروەکو حاجی قادری کۆی لە دێڕە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

منم ئێستا وارثی عیســــــــا
بێ ژن ومنداڵ مەئیوس‌و مەئوا

سالمیش کە باسی دلّدارەکەی دەکا دەڵێت ئەوەتا لە زگ پەیدا بوون ڕاوەستایە ئیتر زگی نابێت نەوەی لێ ناکەوێتەوە هەروەکو دایکی حـەزرەتی عیـسا، هەمدیـسان ئـەو نوورەی لە تۆوە پەیدا دەبێت هەروەکو دەستی حەزرەتی موسایە کە هەرکاتێك دەستی لە باخەڵیا دەناو پاشان دەریدەهێنا سپی دەبوو دەدرەوشایەوە: (اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنْ الرَّهْبِ) (القصص- ٣٢).

عەقیم ئاسا لە زگ وەستایەوە حەملی نەما ئیتـر
لە پاش تۆ دایەی دونیا بە مثلی مادەری عیســا
لە قوببەی نووری بوستانت یەدی بەیضا نـــمودارە
ئەبەد ناگاتە دوگمەی جێی جامەی تۆ کەفی موسا

گەردون بە ئاسانی لە نزیکەوە خوێنی حەڵاڵ کردووە، گەر بە تەماشا کردنێـك بـە غەمزەی چاوەکانی خوێنی بە فیڕۆ بدات، گەیشتنیش هەروەکو شەوی میعـراج بـۆمن گەر هەر کاتێك بـە پەنجـە مـانگی شـەق بکـات، سـالم هـەوڵی داوە شـەوی ئیسراو میعراج(سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى)، کـە خوای گەورە شەوڕەوی بە پێغەمبەر (ﷺ)کرد هـەروەها ئیـشارەتیش بـە مـوعجیزەی پێغەمبەر دەکا کە بە پەنجەی مانگی شەق کرد: (اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ)(قمر١)

حـــەڵاڵی کـرد بە مەردوم دڵ لە قوربـــا
نەظەر کا غەمزەت ئەر خوێنی هەدەر کا
ویصـــالــەت پـــایەی میعراجـه بۆ من
لـــە ڕوتـــا گـــەر لـەبم شـەق القمر کا

زۆر ئاسانە هەر کاتێك حەزرەتی موسا بییەوێت دار عەسای دەسـتی فرێبـدا ببێتـە مار ترس و سامی خۆی بنوسێت (فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى قَالَ خُذْهَا وَلاَ تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الأُولَى) (طه- ٢١).

دڵبەری منیش موعجیزەی خۆی نیشاندام هەروەك موعجیزەی حەزرەتی موسا:

سەهلە گەر مووسا عەصای کردە حەی و سەهمی نوواند
موعجیـزەی دا دولبـــەرم هەردەم بە مووی گیسو دەکا

من شێت و شەیدای دولبـەرێکم وەرە هـەر بـۆ تاقیکردنـەوە دەستم دەخەمـە نێـو باخەڵیەوە بۆ یەك چرکە ئەگەر دەستم وەکو دەستی مووسا سپی و نەدرەوشایەوە دەستم ببڕن، چونکە حەزرەتی مووسا هەر کاتێـك دەسـتی لـە باخـەڵیا دەنـا سـپی دەبـووو دەدرەوشایەوە:

شـــەهیدی دیدەی مخـموری شۆخێکم منی شـــەیدا
لە خاکی مەشهەدم نەزدیکم دەربێ نێرگسی شـەهلا
بە مەحض امتحان دەستم بنێرە با خەلت یەك دەم
لەبن دا بن برن ڕاضیم ئەگەر نەیبوو یەدی بەیضـا

با زۆر بەپەلە هەواڵی خۆشی گەیاندمی، ئەم هەواڵەش هەردوو بۆنی خۆش وایە کاتێك بای لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ بۆنی مژدە بەخشین ڕۆشنای چاوە هەروەکو چۆن حەزرەتی یعقوب لە تاو دووری یوسفی کوڕی چاوەکانی کوێر بوو، بەڵام کاتێك کراسەکەی (یوسف)یان بۆ هێنا لە دوورەوە بۆنی کراسەکەی بۆهات: (وَلَمَّا فَصَلَتْ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَنْ تُفَنِّدُونِي) (يوسف- ٩٤).

کاتێکیش کراسەکەی (یوسف)یان بەسەر چاوی چاك بۆوە: (فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنْ اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ) (يوسف- ٩٦).

گەیاندی بۆم سەبا بۆنی عطری گێسو

وەکو پیراهەنی یوسف بۆ یعقوب

ذوالجوشن ئەو کابرایە بوو کە سەرلەشکری یەزیدی کوڕی معاویە بوو، حەزرەتی حوسینی شەهید کرد، ئیتر ئەو خوێنە بە زوڵم ڕژاوەی حسینی لەدەشتی کەربەلا تاکو ڕۆژی حەشر ئەو خوێنە لە خەنجەرەکەی ذوالجوشن دەتکێ، ئەوا ئیمرۆش خوێنی دڵی مەظلومان بە خەنجەری موژگانی تۆوە دەتکێ:

وەك خەنجەری ذی جەوشەنتا ڕۆژی حەشر دەتکێ

خوێنی دڵی مەظلومان بەو خەنجەرەی موژگانت

من بەناو دەنگو شوهرەتو لەش لارم سالمو لەناو خەڵکیدا واناسراوم، بەڵام لە ڕاستیدا من وەکو حەزرەتی (یعقوب)م، کە زۆر پەرۆشی (یوسف)ی کوڕی بوو بەڵام حەزرەتی یعقوب لە دوایدا بە یوسف شاد بۆوە، بەڵام من زۆر زەحمەتە جارێکیتر بە دیداری تۆ شاد ببم:

بە شوهرەت (سالم)م ئەمما لە هیجرەت پیری کەنعانم

دەبێ ڕوشەن بە وەصڵت دیدەی تارم وەڵا زەحمەت

سەروکاری ئیشی من وەها ئالۆز بووە، ڕەنگە کەمکەس هەبێت بتوانێت کـاری مـن چارەسەر بکات، تەنها ئەو کەسەی کە کەریمو غـەفورو رەحـیمو وەدوود بێـت، دیـارە ئەوانەش هەموو لە ناو صیفاتی خوای گەورەن:

سەرو کاری منی بێ کەس بە کەسێکە هەمە جا

کێ کەریمەستو غفورەستو رەحیمەستو وەدوود

ئەو شمشێرەی علی کوری ابـی طالـب شـەری پێـدەکرێت لەگـەڵ کافرەکانـدا نـاوی ذوالفقار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی عەلیو شیرەکەی دەفەرموێت: (لافتی الاّ علی لاسیف الاّ ذوالفقار) ئیمروش دولبەر بەرامبەر بە رووی سالمدا تیغی برۆی هەڵکێـشاوە لە سالم هەروەکو چۆن عەلی (ﷺ) ذوالفقاری هەڵکێشاوە بەرامبەر بە کافراندا:

بە رووما‌دا لە ئەبرۆی تیغی کێشا

وەکو سەیفی عەلی بۆ صەفی کوفار

سالم ئیمرۆ گەلێك گرفتارەو کەوتۆتە داوی خۆیەوە بە هیچ هەوڵو کۆشیش رزگـاری نابێت، بۆیە بە خوێنی خۆی وێنەی تۆ دەکێشی هەروەکو چۆن مەنصوری حەلاج لەسەر وشەی (انا الحق) کۆشتیانو خوێنی ڕژا سەر زەوی، بە خوێنەکەی دەنوسرا (انا الحق):

نەیی ڕۆیین نەرێ بۆ دەستی کۆشش

ئیلاهی کەس نەبێ وەك من گرفتار

دەکێشێ خوێنی سالم صورەتی تۆ

وەکو مەنصور ئەگەر ببرێتە سەردار

لە شەوا مانگ دەردەکەوێ دنیا ڕوناك دەبێتەوە، تۆمن بۆمن وەکو ڕونـاکی مـانگ وایت کە بەدیار دەکەوی دڵم پڕدەبێ لە نوور، جا ئەو رۆژەی دەبێتە مـەحرەم دەگەینـە خەڵوەت، ئیتر ئەو کاتە هـەوای بـاغی بەهەشـتو پەریـەکانی نـاو بەهەشـت ناوێـت نامەوێت بە پەریەکان بگەم.

خوای گەورە دەربارەی پیاوانی خوانـاس دەفـەرموێت لـە پاداشـتی چـاکەی ئـەوان لەبەهەشتدا حۆریان دەدرێنێ، ئەو حۆریانە جوان ناسکن کە کەس دەستی لێنەداون:

هەرشەو کە ماهتابی ڕوخت دەرکەوێ لە دوور
کولبـــەی دڵم لە تیرەگی یا پڕدەبـــێ لە نوور
تا مەحرەم بە بەزمی وصالت لە خــــــەلوتا
ناکەم هەوای باغی بەهەشتو لەقای حـــوور

سالم خۆی دەچوێنێ بە مەنصوری حەلاج کە چۆن مەنصوری حـەلاج دەیگـوت (انـا الحق) دیارە ئەم قسەیەش بە ظاهری شەرع درووست نییە بۆیە بڕیاریان دا کە مەنـصور لەدار بدەن کەوا باوە، بەڵام مەنصور کوژراو بە خوێنەکەی (انا الحق) نوسرا لێرەدا سالم دەڵێت منیش گەر بێتو بە زۆری بمگرن وەکو مەنصور بمکوژن خوێنی منیش برژێ انا الحق دەنوسرێ:

مقام کـــەن بە زەجر ئەرداری منصور
دەکێشێ خوێنی من نەقصی انا الحق

من لەدڵو خەیاڵمە ڕۆژێك بێم حەجی کەعبەی تۆ بکەمو لەوێش هێندە فرمێـسکی چاوم هەڵبژێرم، هەروەکو ئاوی زەمزەم، دیسان رووی حەزرەتی موسا لە کێـوی طـوردا کە قسەی لەگەڵ خودا کرد، دەمیـشت بـۆ مـن وەکـو مەسـەلەی حـەزرەتی عیـساو مریەمی دایکیەتی:

لە دڵمایە حەجی کەعبەی خەیاڵت
سەتای چاوم دەگرێی ئاوی زەمزەم
روخت بۆ موسی دڵ ئاتـــەش طور
دەمت بۆ حاڵی من عیساو مریەم

ئەو تاقە خاڵەی کە لەسەر ڕووتە، دەبێت لاچێت، تاکە چارەیەکیش بۆ لابردنی ئـەو خالە دەبێت موعجیزەی حەزرەتی موسی هەبێت کە ناسراوە بە (کلیم) کاتیک موسـی دەچوە کێوی طور قسەی لەگەڵ خودا دەکرد (أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي) ئـیتر ئـەم نازناوە بە حەزرەتی موسا بەخشرا، بەژنو باڵای یارەکەشی زۆر ڕێكوپێکە هەر دەڵێـی گولزاری باغی (ئیرەم)ـە رووشت هەروەکو روخساری فیردەوسە کە خۆی ئارایش داوە.

تاقە خالی رووت بە تەجدیدی مسیح
ســــــاحرە چارت بە اعجازی کلیم
نەقشە رووت بۆ دڵ شاهی نەقشبەند
یاری دێرینە بە قورئانی قدیـــــم
قامەتت سەروە بە گولزاری ئیـــرەم
سیەروخسارت بە فیردەوسی نعیـــم

لە قورئاندا زۆرجار باسی حەزرەتی موسـاو فرعـەون کـراوە، کـە کاتێـك فرعـەون جادوگەرەکانی خۆی ئامادەکرد لەگـەل موسـی کـە پێـشبرکی بکـە، گوتیـان: (قَالُوا يَامُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى)(طه- ٦٦).

کاتێکیش حەزرەتی موسا دارعەسایەکەی دەستی فرێدەدا دەبونە مارێکی زۆر گەورە (فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُبِينٌ) (الاعراف- ١٠٧):

زەمزمەی عیشقە لەناو مصری وجودم هەمەجا
ئاتــەش ئەفشــانە هەناسەم وەکو ثعبانی مبین

یوسف کوری یەعقوب سلاوی خوای لێ بێت زۆر جوان بوو، زولیخـا ژنـی عــەزیزی مصر عەشقی جوانی بوو، خۆی تەسلیمی یوسف کـرد، بـەڵام حـەزرەتی یوسـف رازی نەبوو.

کاتێك خەڵکی مصر سەرزەنشتی زولیخایان کرد کە ئەم کارەی بۆ کـردووە ئـەویش گوتی ئێستا وەڵامتان دەدەمەوە (فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ) (یوسف- ٣١).

منیش وەکو عەشقی زولیخا بۆ یوسف ئەقڵم لە مێشکیدا نەما بۆ یوسف کە وەکو مانگە لە دەشتی کەنعاندا:

کەفی عەقـــڵی بڕی دڵ وەك زولیخا
بەتیغی غەم لە عیشقی ماهی کەنعان

ئەوە چ شتێکە تێکـەڵاوی یـەکتری کـراوە هـەتا نەقـشی جـوانی تـۆی لێ هاتۆتـە بەرهەم؟ خۆی خوای گەورە مرۆڤەکانی لە قوڕ دروست کردووە (إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ) (ص- ٧١)

چە نەقاشێ ئەتۆی لێکدا لەگەل ڕوو
تعـــالی خلـــق الانسان من طین

لێوەت وەکو خونچە وایە هـەرکاتێك زەردەخەنـە دێتـە سـەر لێوانـت ئـەو خونـچە دەپشکوێ‌و دەکرێتەوەو شەق دەبا هەروەکو ئەو موعجیزەیەی پێغەمبـەر(ﷺ) کاتێـك بە ئەنگوستی پەنجەی ئیشارەی بۆ مانگ کردوو مانگ شـەقی کـردو بـووە دوو لـەت (اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ)(قمر- ١).

لە ڕەشکی لێوی تۆ خونچەی شەقی برد
لە خەندەت معجزەی شـــق القمر بوو

لەبەر ئاوەدان کردنەوەی ئەم وێرانەیەی زەوی خوای گەورە ئادەمی کە دروسـت کـرد لە بەهەشتدا نیشتەجێی کرد (وَقُلْنَا يَاآدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَدًا

حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الـشَّجَرَةَ وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الـشَّجَرَةَ فَتَكُونَـا مِـنْ الظَّـالِمِينَ) (الاعراف- ١٩).

جا ئادەم لە بەهەشتدا گەلێك شادبوو وەکو پاشا بەڵام تەمەنی لە بەهەشتدا گەلێك کەمبوو:

لەبەر تەعمیری ئەم وێرانە جەننەت مولکی ئادەم بوو
حەقیقەت پادشـــاهی کردو لاکین موددەتی کەم بوو

دیسان سالم دێتەوە سەرباسی موعجیزەی شەق القمر دەڵێ گەر بێتو ئێستا ناو لـەپم بخرێتە سەر روومەتی ناسکت ئەو شوێنەی کە من بۆسەم بۆ ناوەتەوە وەکو موعجیزەی شەق القمر شەق دەبێ:

بە ئاهیستە لەپم گەر بێتە سەر رووی نازکت یەکدەم
لە جێی بۆسەم دەبینی معجزەی شەق القمر ئەمشەو

ذوجەوشەن، وەکو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆکرد حەزرەتی حسینە لە دەشـتی کەربـەلا شەهید کرد جا هەرکاتێك دەفێك لەسەر سینەی رەقیبە ئەوە وەکو خەنجەر وایە لە دڵی منی دەدەی وەکو ئەو خەنجەرەی ذوالجەوشەن کە حەزرەتی حسین ی پێ شەهیدکرا:

دەفمەیی ئەی کاشکی دەمدا لەسەر سینەی رەقیب
تیری ئاهی دڵ کە هەروەك خەنجەری ذول جەوشـەنە

(سالم) شاعیر خۆزگە دەخوازێ کە بە لیقای خوا بگـات سـۆزو بـەزەیی بەرامبـەری بنوێنێ، زۆریش رازیە تەنها ئەگەر بـە وشـەیەکیش وەلامـی بداتـەوە کـە وشـەی (لا ترانی) بێت، لاترانی ئاماژەیە بەو قسەیەی کە حەزرەتی موسا داوای لە خـوای گـەورە کرد خۆی پێ نیشان بدات، خوای گەورەش لە وەلامـدا فـەرموی: (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنْ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنْ

اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِـي فَلَمَّـا تَجَلَّـى رَبُّـهُ لِلْجَبَـلِ جَعَلَـهُ دَكًّـا وَخَرَّ مُوسَـى صَـعِقًا) (الاعراف ١٤٢)

لەقا خواهیش دەکەم دایم کە بنوێنی وەلێ ناچار
رضام حەرفێ لە جوابت بشنەوم با لن ترانی بێ[٢]

ئ

# مستەفا بەگی کوردی

مستەفا بەگی کوری محمود بەگ لە ساڵی ١٨١٢ز لە سلێمانی لەدایك بووە، هەر لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٥٠ز کۆچی دوایی کردووەو، لە گردی سەیوان نێژراوە.

شاعیر وەکو منداڵانی سەردەمەکەی خۆی لە حوجرە فێری خوێندەواری بووە، بەڵام درێژەی بە خوێندن نەداوە بۆ ئەوەی ببێتە مەلا.

مستەفا بەگی کوردی بە یەکێك لە کوڵەکەکانی قوتابخانەی شیعری بابان لەقەڵەم دەدرێت، بەڵام بەداخەوە بەرهەمێکی کەمی شاعیر کەوتۆتە دەست خوێنەران جگە لەوەش کە ناوی شاعیر لەتەك نالی‌و سالمەوە دێت، بەڵام وەکو پێویست ئاور لە کوردی نەدراوەتەوە، گەلێك لایەنی شاراوەش هێشتا پەردەی لەسەر هەڵنەدراوەتەوە، کە ئەوەش وایکردووە گەلێك شتی ئەفسانە تێکەڵ بە ژیانی مستەفا بەگی کوردی بکرێت، کە هیچ بنچینەیەکی زانستی نیە.

گوایە مستەفا بەگ عەشقی قادر ناوێك بووە، ئەو قادرە بۆتە سەرچاوەی ئیلهامی شیعری مستەفا بەگ.

دەگێڕنەوە کە مستەفا بەگی کوردی بە شای ئێران گەیشتووە، لەگەڵ ئاقانی شاعیری گەورەی ئێران شەرشیعری کردووە، شای ئێران گەلێك سەرسام بووە بە کوردی، گەرچی ئەو گێڕانەوەیە جێگای گومانەو عەقلی مرۆڤ بۆی ناچێت کابرایەکی کوردی خەلکی بابان بگات بە شای ئێران‌و لەوێندەر لە مەجلیسی شادا کابرایەکی سونی مەزهەب هێرش بکاتە سەر مەزهەبی شاەو ئاقانی شاعیر، بەڵام هەرچۆنێکیش بێت ئەوا هەرگیز لە شاعیریەتی‌و هەڵوێستی مستەفا بەگ کەمناکاتەوە، بەڵام

مستەفا بەگ کە ئاوارەی ئێران کرابێ ئاسان نیە بگاتە شای ئێران، جگە لەوەش لە دیوانەکەی کە ئێستا لەبەردەستدایە هیچ ئەوە نادەنە دەست کە گەیشتووەتە کۆشکی شاهانەو شەڕەشیعری لەگەڵ ئاقانیدا کردبێت.

ناوی قادر گەلێك جار لە هۆنراوەکانی کوردی بەکار هاتووە، بێ ئەوەی بە تەواوی ساغ کرابێتەوە ئەو قادر ناوە کێیە؟

ئەگەر ئەوە راست بێت کە کوردی هەوڵی ئەوەی دابێت کە عەشقی مەجازی بگورێت بۆ عەشقی حەقیقی، دەکرێت بڵێین ئەو قادرە مەبەستی لە رێبازی قادری بێت، گەرچیش هیچ تروسکایەك نیە کە کوردی لەسەر رێبازی قادری بێتو رێبازی سۆفیزمی گرتبێتەبەر، کەواتە تەنها تاکە رێگایەك دەمێنێتەوە کە بلێین زۆر نزیکە ئەو قادرە ناوە ناوی ئافرەتێکی خۆشەویستی خۆی بێت، بەڵام وەکو رەمزێك بەکاری هێنا بێ، ئەویش لەبەر ئەوەی بارو زروفی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە رێگای نەدابێ بەئاشکرا ناوی بهێنێ.

جوانی پانتایەکی فراوانی لە شیعرەکانی کوردیدا داگیر کردووە، زۆربەی ئەو جوانیەش بە یوسفی کوڕی یعقوب چواندوە، لەوەوە بەدیار دەکەوێت کە مستەفا بەگ ئەگەرچی مەلا نەبووە، بەڵام رۆشنبیری ئاینی هەبووەو کەوتۆتە ژێر کاریگەری کارەساتو ڕوداوە ئاینیەکان، ئەوە باس لە جوانی حەزرەتی یوسفو زلیخا دەکات، کە چۆن زولیخا عەشقی جوانی یوسف بووەو خۆی تەسلیم بەو کردووە، کاتێکیش خەڵکەکە بەوەیان زانی سەرزەنشتی زولیخایان کرد ئەویش بۆ ئەوەی قەناعەت بە خەڵکەکە بهێنێو پاکانەی خۆی بکات، خەڵکەکەی داوەت کردوە هەریەکەیان چەقۆو سێوێکی دادەستیان، پاشان یوسفی پێ نیشان دان ئەوانیش لە تاوی جوانی یوسف ئاگایان لەخۆ برا دەستی خۆیان بە چەقۆ بریو گوتیان: (حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ) (یوسف- ٣١).

کوردی دەڵێ: هەرکاتێك یوسف جوانی بەدیارکەوت من زانیم کەوا عەشقی ئەو دەبێ:

که شوعلەی طەلعەتی یوسف طلوعی کرد که چەھ زانیم
که عیشق ئەز پەردەیی عیصمەت بیرون ئارەد زولیخا را

دیسان لەوەسفی جوانیدا دەڵێت ئەگەر حۆریەکانی بەهەشت خۆیان لە ئاوی کەوثەر بشۆتەوە، هەرچی پیسی هەیە فڕێی بدەن، ئەوا بە فاڵو ڕەنگو روخسارت حاجەت بەرووی یار ناکات چونکە ناگەن بەتۆ.

ئەگەر حۆری لە کەوثەر شوتوشۆی خۆی بەتۆ نابێ
بە ئاب‌و ڕەنگ‌و خاڵ‌و خەت چ حاجەت بە روویی زیبارا

کاتێك کە حەزرەتی یوسف لە باوکی دوور کەوتەوە بۆ وڵاتی میسر، باوکی واتە حەزرەتی یعقوب لە تاو دووری یوسف چاوەکانی کوێر بوون، بەڵام پاشان حەزرەتی یوسف کراسەکەی خۆی ناردو بەسەر چاویاندا هێنا چاوەکانی حەزرەتی یعقوب چاك بۆوە، جاپێش ئەوەی قاسیدەکە بێت حەزرەتی یعقوب گوتی: (إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَنْ تُفَنِّدُونِي) (یوسف- ٩٤).

کوردیش دەڵێت گەر بێتو جارێك بەلاماندا تێپەر بێت ئەو تێپەر بوونە وەکو کراسەکەی حەزرەتی یوسف بۆمن کە تارمای دڵو دەروونم بڕوێتەوەو ڕۆشنای بۆ چاوەکانم:

قمیصی یوسفە بۆ چاوی تاریکم وەکو یعقوب
سەبا گەر جارێك بەلامان بێنێ گەر بۆی عەرەقچینت

ئەمجارە بە پێچەوانە شاعیر دەڵێت من وەکو حەزرەتی یوسف چۆن کراسەکەی نارد بۆ باوکی‌و چاوەکانی ڕووناك بونەوە تۆش هیمەت بکە وەکو شیفا بەدیدارت شادبم‌و

چاوەکانم ڕوناك ببێتەوە:

کوێر بووە وەکو یەعقوب بە خودا دیدە لە بۆت
سـا بنێرە وەکو یوسف بە شفای دیدە لە بۆت

ئەگەر بێتو تۆش وەکو حەزرەتی یوسف خۆت کەنارگیر بکەی کە بێ تاوان بوو چەند سالآن خرایە بەندیخانەوە ئەو کاتە دەماری عیشق‌و ریشی بە توهمەت لەگـەڵ پارچـەی کەلێنی یەخـەی کراسـەکەی، چـونکە کاتێـك ذولیخـا هـەوڵی ئـەوەی دەدات یوسـف تەسلیمی بێت، بەلآم ئەو ڕازی نەبوو، ذولیخا کراسەکەی ڕاکێشا:

ئەگەر بێتو بە ناحەق بۆت بکەی پەنهان وەکو یوسف
وەریدی عیشق‌و ڕیشی تۆ همـەت‌و چاکی گریبانی

شاعیر بێ زاری خۆی دەردەبڕێت لە دەست عەشق، بەلآم هیچ کەسێك لە عاشقاتیدا موخەبر نیە لە دەسەلآتی خۆیدا نیە، کەوایە با ئەوکەسانە کە عاشقن یاخوا لە زولیخا خراپترو شێت‌و شەیداتر بێت، چونکە زولیخا گەلێك عاشقی یوسف بوو شێت‌و شەیدای ببوو.

کەس لە ڕەویەی عەشق‌و ڕێگەی عاشقی موخییر نیە
شـێـت‌و شـەیداتـر ببـوایـە زولیـخا کاشـــکێ

شاعیر سویند دەخوا بە جوانی حەزرەتی یوسف کەلە جوانیدا وینـەی نـەبووە، هـەر ئەو حەزرەتی یوسفە کە نووری چاوەکانی حەزرەتی یـەعقوبی بـاوکی بـوو، هەرلەبـەر یوسفی کوڕی کوێر بوو، هەر بە کراسەکەشی چاوەکانی چاك بۆوە.

بەحسنی یوسف ئاسات‌و بە خولق‌و لوطفی شیرینت
چراغی بەزمی خوسرەو نووری دیدەی پیری کەنعانی

ذوجەوشەن سەر لەشکری سوپای یەزیدی کوڕی معاویە لە نزیك شاری کەربەلا هێرشی کردە سەرحسینی کوڕی عەلی هەمووی شەهید کردن، بەو شێوەیە خوێنی شەهیدان هەتا ڕۆژی حەشر ئەتکی لە نێوان موژگانت:

وەك خەنجەری ذی جەوشەن تا ڕۆژی حەشر دەتکێ

خوێنی دڵی مەظڵومان لە ناوکی موژگانت

ئوبەی کوڕی خەلەف پارچە هێسکێکی بە دەستەوە بوو بە گاڵتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: کێ ئەو هێسکە زیندو دەکاتەوە (أتری الله یحی هذا العظام بعد مارمت) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (نعم یبعثك الله و یدخلك الجهنم) هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (قال من یحی العظام وهی رحیم) (یاسین) کوردی دەڵێت گەیشتنی تۆ زیندوم دەکاتەوە هەروەکو چۆن هێسك یەکدەگرێتەوە هەتا ئەو کاتەی لاشەم دەبێتە گەردو تۆز خاك ئەو گەردەش هەموو بە دەم بای شەماڵەوە دەفەوتێ:

وەصلی تۆ (یحی العظام)و قالبی فەر موودەمە

بێلە تۆ بۆ خوا بلا شاد بێ بەگەردم بای شەماڵ

تۆ پەریەکانی بەهشتی کە هێندە جوانی یا خود تۆ گوڵێکی لە گوڵە جوانەکانی باغی ئیرەم یاخود ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی یاخود ئەو ڕۆرە بە تیشکەی کە هەموو زەوی روناك کردۆتەوە

حۆریی باغی جینانی یا گوڵی ئیرەم

ام النجوم العرش ام شمس علی فوق العلم

شاعیر دەڵێت ئەی دۆستو یاران هەرگیز داوای ئەوەم لێ مەکەن کە لەگەڵ یاردا رابوێرم و، چونکە هەر کاتێك کە ئەگەم بە یار ئەوا شێتو بێهۆش دەبم، هەروەکو چۆن بای (صرصر) دێت هەمو خەڵك بەو بایە بێزارو هەراسان دەبن تاکو وایان لێدێت هەموویان دەمرن بە هۆی ئەم بایەوە، خوای گەورە کاتێك قارو غەزەبی خۆی گرت لە

هۆزی ثمود ئەو بایەی نارد کە حەوت شەو هەشت ڕۆژی خایاند (وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ) (الحاقة- ٧).

قەت مەڵێن یاران لەگەڵ فیرقەت وەرە سازش بکە
شێت ئەبووم وەك من خۆم تووشی بای صەرصەربکەم

حەزرەتی عیسا سڵاوی خوای لێ بێت موعجیزەی ئەوە بوو مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خوا (وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ).

شاعیر دەڵێت بەڵکو ئەمە خوایە گەر بۆ جارێك بەلای گۆڕەکەمدا تێپەڕ ببێت هەروەکو عیسا فەرمان بکا هەموو هێسکە ڕزیوەکانم کۆ بکاتەوەو پاش فەوتنم زیندوم بکاتەوە

گەر وەك عیسا لە پاش مردن بەسەرما، ڕابرێ
تجمع العظم الرحيم تحمينى بعد العدم

مەنصوری حەلاج لەسەردەمی عەباسیەکان دەیگوت (انا الحق) کە ئەمەش بە ظاهیری شەرع کفرە بۆیە دادگایان بۆ دامەزراند پاشان فەرمانی دادگا دەرچو بە کوشتنی دەڵێن کە خوێنی ڕژا بە خوێنەکەی (انا الحق) دەنوسرا کوردیش دەڵێت کاتی مردنم لاشەکەم بووە تۆزو گەرد هەروەکو مەنصور حەلاج ناوی تۆی پێ دەنوسێ چونکە مەنصوری حەلاج کاتێك کوشتیان انا الحق دەنوسی کە عەشقی ئەو وتەیە بوو بە زیندویی، منیش عەشقی تۆم پاش مردن بە سروشکم ناوی تۆ دەنوسم:

سروشکم نەخشی ناوی تۆ دەکێشێ
جیگای سێدارەکەی مەنصورە ئەمشەو

شاری کەربەلا لە ساڵی ٤١ی کۆچی کارەساتێکی گەورەی لێ رودا، کە ئەویش کوشتاری بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە سەردەمی یەزیدی کوڕی معاویە، شاعیریش ئەوها کوشتەی دەستی دڵدارەکەیەتی، هەروەکو چۆن کەو پێیەکانی سورە تۆش بە خوێی من ئاوها پەنجەکانی خۆت سور کردووە.

چونکە ئەمڕۆ من شەهیدی کە بەرلایی عیشقی تۆم
هەروەکو کەو پەنجەکانت وا بە خوێنم رشتووە

سامیری لە سەردەمی حەزرەتی موسادا ژیاوە، کابرایەکی ساحیرو جادوگەر بووە. بە هۆی سیحرەکانی خەڵکێکی زۆری لە خشتە بردووە، جا بۆ ئەوەی عاشق فریو بدرێ سەرنجی دڵو دەرونی عاشقان بۆ خۆی رابکێشێ ئەو دلبەرە ئەوەندە مەکر بازە، رەنگە کەسانی وەکو ساحیری ببنە شاگردانی واتە ئەو وەستایەو سامیریش شاگرد خوای گەورەش دەربارەی سامیری دەفەرموێت: (قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنْ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ) (طه- ٨٥).

بۆ فریوی عاشقانو جەزبی دڵ وا ماهیری
ڕەنگە شاگردیت بکا میهتەر نەسیمی سامری

هاروتو ماروت لە قورئاندا باسیان کراوە (السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ) (البقرة- ١٠٣). مامۆستا عبدالكريمی مدرس دەفەرموێت (ملكين) بەفەتحەی لام واتە دوو مەلائکە بەڵام بە کەسرەی لام واتە دوو پاشا بەڵام ئەو دوو پاشایە پیاوی چاك بۆینە بە مەلائکە ناویان براوە بەڵام خوێندنەوەی یەکەم واتە (الملكين) دوو مەلائکە راسترە ئەو دوو مەلائکە نێردراوی خوا بوینە، دوایی خەلکیان لە خشتە بردووە فێری سحریان کردوون خوای گەورەش غەزەبی لێ گرتون سەرپشکی کردوون لە نێوان سزای دنیا یاخود قیامەت ئەوانیش سزای دنیایان هەلبژاردووە گوایە سەراوژێر بە لەناو بیردا

هەلواسراون، بەڵام موفەسیرەکان ئەم قسەیە ڕەت دەکەنەوە، چونکە خوای گەورە دەربارەی مەلائکە دەفەرموێت: (لا یَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَیَفْعَلُونَ مَا یُؤْمَرُونَ) تفسیری نامی بەرگی یەکەم.

شاعیر ئەم بەسەرهاتەی بەم شێوەیە سوود لێ وەرگرتووە کە چاڵی سەرچەناگەی خەڵکێکی زۆری تێدا ئەسیر کراوە، هەروەکو چۆن هاروت و ماروت لە چاڵدا هەڵواسراون:

لە چاهی ژێری لێوت وا ئەسیرن
هەزارانی وەکوو هارووت و مارووت*

---

*) هۆنراوەکان لە دوایی (کوردی) چاپخانەی کوردستان ١٩٧٢ کۆکردنەوەی گیوی موکریانی.

# مەولـــەوی

ناوی (سەید عبدالرحیم کوڕی مەلا سەعید)ە لە نەوەی (مەلا یوسف جان) ئەگەڕێتەوە سەر خواناس سەید موحەمەدی زاهید کە بە پیرخدری شاهۆ بەناوبانگە، لە ساڵی ١٨٠٦ لە گوندی سەرشاتە ناوچەی تاوگۆز لە دایکبووە، وە لە ساڵی ١٨٨٢ لە مەڵبەندی لەدایکبوونی کۆچی دوای کردووە هەر لەوێش نێژراوە.

مەولەوی بۆ خوێندن گەلێك شوێنی کوردستان گەڕاوە بەتایبەتیش لە مزگەوتی دارالحسان لە شاری سنە کە کاتێکی زۆری سەردەمی فەقێیایەتی بەسەر بردووە، ئەو حوجرەیەی کە مەولەوی تیادا خوێندویەتی ژووری ژمارە ١٩بوە، کە ئێستاش هەر بە ژوری مەولەوی بەناوبانگە، دواجاریش مەولەوی ئیجازەی مەلایەتی لە شاری سلێمانی وەردەگرێت وە دەست دەکا بە وانە گوتنەوە، پاشان هەوای سوفیەتی ئەچێتە مێشکیەوە، بۆ ئەو مەبەستە دەچێتە تەوێڵەو دەبێتە موریدی شێخ عثمان سراجەدین لە پاڵ وانە گوتنەوەبە فەقییان خەریکی سلوك ئەبێت.

مەولەوی جگە لەوەی بەهرەیەکی شیعری خۆرسکی هەبووە، زانایەکی گەورەش بوە لە مەسەلەی عەقیدەی شەرعیەکان، هەر بۆ نمونە گەلێك دانراوی بە پێزی داناوە لەبارەی عەقیدەوە، وەکو عقیدەی مەولەوی‌و عەقیدی مرضیە کە بریتیە لە ٢٤٥٤دێڕە شیعر، باس لە عەقیدەی ئەهلی سونەو جەماعە دەکات، لەهەمان کاتیشدا شەرعزان بوو، ئەوە لە ساڵی ١٢٧١ کۆچی شێخ سراجەدین، مەولەوی شاعیر لەگەڵ شێخ عبدالرحمنی کوڕی ئەنێری بۆ شاری سنە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان غولام شاخان‌و مەلای سنە، کەواتە ئەو بەڵگەیە لەسەر ئەوە مەولەوی کەسێکی

لێهاتوو شارەزا بووە، ئەگینا شێخ عثمان سراجەدین بـۆ مەسـەلەیەکی ئـەوها گـرنگ نایبنێرێ مەولەوی لە دانراوەکانی تریدا وەکـو الفضیلە کـە ٢٠٢١ بەیتـە شـیعرە بـە زمانی عەرەبیو کتێبی الفوائع کە ٥٢٧ دێڕ شیعرە بە زمانی فارسی وەستایەکی بـێ وێنەی نواندوە، بەڵام ئەوەنە هەیە ئەو کتێبانـەی کـە باسـکرا هـەمویان دەچـنە پـاڵ هونراوەی فێرکردن (الشعر التعلیمی) کە دوورە لە سـۆزو ئەندێـشە، بـەڵام مەولـەوی وەستایانە توانیویەتی بەشێوەی هۆنینەوە (نظـم) دایان بڕێژێت ئەوانەی تریشی هـەموو بریتیە لە هۆنراوەی بۆنە، کە بۆ لاواندنەوەی کەسـێکی نزیکـی گوتویـەتی یـاخود لـە وەڵامی نامەیەکی خۆشەویستدا وەڵامی داوەتـەوە بـە شـێوەیەکی ناسـكو سـەلیقەی شاعیرانە.

وەکو باسکرا مەولەوی مەلایەکی زاناو سوفیکی راسـتگۆی تەریقـەتی نەقـشبەندی بووە، وە دانراوەکانی کە باس لە عەقیدە دەکات بەڵگە لەسەر ئەوە ئاین رەنگیداوتەوە لە هزرو بیری مەولەویدا وەگەڵێك جاریش دەبینین مەولـەوی شـاعیر ئایـەتی قورئـانی وەرگرتوە (اقتباس) تێکەڵکێشی هۆنراوەکانی خۆی کردووە، یاخود بـە مانایـەکی تـر بڵێین ئاین رەنگی داوەتەوە لە هۆنراوەکانی.

ئەوەتا مەولەوی شاعیر سـوود لـە چـیرۆکی حـەزرەتی یوسـف وەردەگرێـت کاتێـك حەزرەتی یوسف فڕێ دەدرێتە ناو بیر لەلایەن براکانیەوە (والقوه في غيابة الجب) پاشـان کاروانچی بۆ ئاو خواردنەوە دێنە سەر بیرەکە بۆ ئەوەی ئاو بخۆنەوە دۆڵەکەی ئەهاوێنـە ناو بیرەکە (یوسف)ی دەهێنە دەرەوە (وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ فَـأَدْلَى دَلْـوَهُ قَـالَ يَابُشْرَى هَذَا غُلَامٌ) (یوسف ١٩).

کاروانەکە یوسف لەگەڵ خۆیاندا دەبەن بـۆ میـسر دەیفرۆشـن، کاتێـك لـە بـازاردا دەیفرۆشن، پیرژنێك خۆیو کلافەیەك دەزوو دەیـەوێت یوسـف بکرێـت، بـەڵام کڕینـی

یوسف هێندە ئاسان نیە پیرێژن بیکڕێ، بەڵکو خوای گەورەی مەبەستی خۆی هەیە لە فرۆشتنی یوسف (وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ).

یەکێ وە مایەی گەنج (کەی)ەوە

چون منیچ وەتای فەرتووت نەیەوە

مەولوی چۆتە ناو فەلسەفەیەکی قوڵی ئاینپەروەریەوە دەڵێ ئەی خودایە ئەگەر بەو هەموو نیشانانەی پێشەوە کە پێت نیشانداوین من تۆ نەناسم، لەمەودواش هەرچەند نیشانەی تر پیشانم بدەی هەر ناتناسم، کەواتە هێندەی پێشەوە بەسە:

بەسەد جیلوەی تەر بێ چوونو چەنی

شاناسایی تۆم غەبۆ هەنێ

مەولەوی تەواو خۆی داوەتە دەست دڵدارەکەی، جگە لەویش کەس بۆ نیە دەست بهاوێتە ناو دڵی مەولەویەوە، هەروەکو چۆن لە حەرەمی مکەی پیرۆز کەس بۆنیە دەستکاری هیچ گیانلەبەرێك بکات، کە ئەوگیانلەبەرانە بە سەربەستیو ئازادی دێنو دەچن (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنْ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ) (المائدة- ٩٥).

کۆترەکەی ئازاد حەریم دڵ بێت

دانەی مۆبەت چین پەی وێت غافڵ بیت

شاعیر بە ئاوازەوە دەژی کەلەلای یارەوە بۆی لێئەدرێ، بەڵام چ جۆرە ئاوازێك؟

ئاوازی یەکەم لەگەڵ گوێ بیستبونی لەگەڵ ئاوازەکە ئەتوێتەوە، کاتێکیش گوێ بیستی ئاوازی دووەم دەبێت سەرلەنوێ گیانی بەبەردا ئەکرێتەوەو سەرلەنوێ زیندوو دەبێتەوە هەروەکو چۆن حەزرەتی ئیسرافیل فوو دەکا بە صور هەمو زیندەوەر دەمرێتو گیان لەدەست دەدا دنیا تێك دەچێت، لە جاری دووەمدا کە فوو دەکاتەوە

بە صور سەرلەنوێ گیانلەبەران زیندوودەبنەوە (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ) (الزمر- ٦٨).

یەکێ یەکجاری تاونۆمەوە

ئەو یەك لاونۆم یاونۆمەوە

مەولەوی تەواو بڕوای بەو پەیمانە هەیە، کە خوای گەرە داویەتێ ئەویش ئەوەیە، کە دبێت هەموو کەسێك بمرێت، ئەودەمێنێتەوە هەر خوای گەورەیە: (مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ) (الرحمن- ٢٧).

بۆیە شاعیر پەیمانی لەگەڵ خودا بەستووە کە بە هیچ شێوەیەك ئەو پەیمانە نەشکێنێت ئەویش بریتیە لە چاکە کردنو دوور کەوتنەوە لە خراپە:

خەڵاسیش داپێت وە یەك پەیمانە

ئازاد بیت جە بەند بەستەی پەیمانە

مەولەوی دەڵێت ئەی دەف لێدەری عەشقی خوا ئامۆژگاری ئەو دۆستو خۆشەویستانە بکە کە بەیانیو ئیوارە واتە پیش ڕۆژ هەڵاتنو ئاوا بوون وە لە نیوە شەودا بێدارن خەریکی خوا پەرستین ڕووەو قیبلە دانیشتون خوا پەرستی دەکەن ڕووی گلەییو سەرزەنشتین بکە من ئەو قسانەم پێ بلێ ئەی مەعدومی بەدبەخت بۆ وا بێ ئاگای لە خواپەرستی (فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى) (طه- ٣٠)

ڕووی پەند ئەو یاران دڵ وە جەهدو جەخت

ڕووی تەوبیخ ئەولای مەعدومی بەدبەخت

مەولەوی ئەو بەسەرهاتەی حەزرەتی ئیبراهیم (سلاوی خوای لێ بێت) بۆمان دەخاتە قاڵبێکی شیعری کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم لە شەودا مانگی دێتو گوتی ئەوە خوایە،

پاشان کە ئاوا بۆ گوتی خوا ئاوا نابێت، پاشان لە ڕۆژهـەڵات گوتی ئا ئەوە خوایـە، کە ئەویش ون بوو گوتی نابێت ئەوە خوا بێت چونکە خـوا بـزر نابێـت (فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لاَ أُحِبُّ الآفِلِينَ فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَاقَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ) (الانعام- ٧٨).

گا چون ستارەی تاریکەی سەحەر

گا قەمـەر گا خۆر مەیو وەنەزەر

مەولەوی کەوتۆتە نەمەنەوە دەیەوێت خۆی دەنەوێتـەوە، چـونکە لـە مـردن نزیـک بۆتەوە گۆریش دەرگای بچوکە مرۆڤ خۆی دەنوێتەوە ناتوانێت بچێتە ناویەوە مەولـەوی پەنای بردوتە بەر ئەم ئایەتە قورئانیە کە دەفەرموێت (وَمَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلاَ يَعْقِلُونَ) (یس- ٦٨).

باڵا کەردەوە مەیل ئەو لای پەستی

وردیـکـڵانـەن دەروازەی هەسـتی

ئەو ڕۆژەی خودای گـەورە ئـەرواحی ئـادەمیزادی کۆکردوەتـەوە پێیـانی فـەرموو: (أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ) (الاعراف). ئەوانیش لەوەڵامدا گوتیان: (قَالُوا بَلَى) بەڵێ تۆ خوامانی، جا لەو ڕۆژەدا هەرکەس خەریکی بازرگانیو سەودای کڕینو فرۆشتن بوو، جا لەوڕۆژەدا خوای گەورە، هەموو شتێکی براندەوە، بۆیە ئیستا من ترسم نیە لە دوعای خەڵکی:

من ڕۆی مامەڵەی گردین خاس وە کەس

جەو راسە بازار شارەکەی ئە لـەس

جەسـەردوکانچەی شای سەر توجاران

هـۆر گرتم کاڵای بـەڵای ئازاران

پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ (مەدینە) ئەو شارە ناوی (یثرب) بوو، بە گەیشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو شارە ناوی گوڕا بۆ مەدینە، جا پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت من ئەو شارەم دەرگاکەشی (عەلی کوڕی ئەبی تالب)ە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە زانستو زانیاریە (انا مدینة العلمو علی بابها) لە نیوە دێڕی دووهەمیشدا باسی حەزرەتی یەعقوب دەکات، کاتێك لەتاو دووری یوسفی کوڕی چاوەکانی کوێر بوو، بەڵام کاتێك کراسەکەی یوسفیان بۆ هێنا لە دوورەوە بۆنی کراسەکەی کرد (قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ) (یوسف- ٩٤).

پاشان کە کراسەکەی بەسەرو چاویدا هێنا ڕۆشنای بۆ چاوەکانی گەڕایەوە (اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَذَا فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ) (یوسف ٩٣)

دەرگای مەدینەی حوسن مەحبووبی

نوور ئەفزای دیدەی جەرگی یەعقوبی

لێرەدا بەسەر هاتێك تەواو پێچەوانەی بەسەرهاتی حەزرەتی یەعقوب بەسەر مەولەویدا هاتوە (جارێکیان لە خانەقای تەوێڵە ئەبێ لە چروستانە دێن بەدوایا کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵ چونکە کوڕێکی نەخۆش ئەبێ، ئەمیش سوار ئەبێ ئەگەڕێتەوە کە ئەگەنە نزیك دێی (عەنەب) هەناسەیەکی درێژ هەڵ ئەکێشێو فرمێسك بە چاوەکانیا دێتەخوار، هاوڕێکەی عەرزی ئەکا بۆچی وا عاجزی؟ ئەمیش دەڵێ چۆن عاجز نەبم حەزرەتی یەعقوب(س) بۆ دڵخۆش بوون بۆنی کراسی حەزرەتی یوسفی کوڕی ئەدرا بە لوتیا، کەچی من بۆنی کفنی کوڕەکەم ئەدرێ بە دەماخما، کە ئەگەنە ماڵەوە ئەزانن لەو کاتەدا ئەو هەناسەکەی هەڵکێشاوە خەریکی کفنکردنی کوڕەکەی بوون.

(دیوانی مەولەوی مەلا عبدالکریم مدرس، ل ١٤)

بازارە وادەی سەودایە ساقی

هەی بگرە فانی وەی بێنە باقی

ئای (حسەین) ئاسا سبەی لە نویٚبێ
ئاخۆ سەر لە کویٚ؟ لاشەم لە کویٚ بێ

شاعیر لە داخی کۆچکردنی عەنبەر خاتووندا ڕوو لە ڕۆشنایی چاوی دەکاو دەڵێت: من دوای عەنبەر ڕۆشنایی چاوم بۆ چییە؟ لێلاٚوی چاو برۆ لافاوی فرمێسك هەڵڕێژەو بیکە بە رووباری خوێن، چونك پاش کۆچی دوایی قیبلەکەم لافاو هاتو ریشەی جەرگو دڵمی هەموو هەڵتەکاندو بردی:

ڕۆشـــنایی چاوم، تا کەی بۆ ماوی
لێـــلاٚیی سادەی ســـوورکە لافاوی
بۆچی؟ قیبلەکەم عەزمی کۆچی کرد
لافـــاوی دووری ڕیشـــەی ژینمی برد

ئەمجارەیان مەولەوی روو لە عەنبەر خاتوون دەکاو دەڵێ: من چەند سەرسەختم ئەی بینایی چاو دڵەی پڕدەردم خۆ تۆ ڕۆیشتی منت جێهێشت کەچی مـن نـەمردم، کەچـی دووری تۆ ئاگرێکی ئەوتۆی بەرداوەتە دڵو هەناوم هیچی تری جێگا نابێتەوە:

بینـــای راســـــــتی دڵەی پڕدەردم
ئای چەن سەرسەختم دووی تۆ نەمردم
بلێســـــەی کورەی دووری بالاٚکـــەت
گەرمیی بێ بەش بووی تۆزی پێلاٚکەت

کارەساتی مردنی عەنبەر خۆشەویستی مەولەوی بەجارێك دڵـی سـوتاندوە، ئێـستا بێجێگاو شوێنە، نازانێت کام شوێن بکا بە جێگای خۆی:

وەها سوتانی سەرای مەیلـــی دڵ
یادەکەت ماوە بۆ مەسکەن خەجڵ

حەزرەتی ئیبراهیم داوای لە گەلەکەی خۆی کرد کە دەست هەڵبگرن لە بت پەرستی، بەڵام وازیان نەهێنا، بۆیە ڕۆژێك دەچێتە پەرستگاکەیان هەموو بتەکان دەشکێنێ، نەمروودی پاشا ڕقی هەڵدەستێت، بڕیار دەدا ئاگرێك بکەنەوەو حەزرەتی ئیبراهیم تێهەڵبدەنە ناوی بسوتێ، بەڵام خوای گەورە ئاگرەکەی سارد کردەوە بۆ ئەوەی بەسەلامەتی ڕزگاری ببێت (قُلْنَا يَانَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلاَمًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ)(الانبياء ٨٩)، جا مەولەوی دەڵێت ئەو بایە وەکو هەڵی ئاگرەکەی حەزرەتی ئیبراهیم وایە هێندە بەتینە لە دەروونم بەرز دەبێتەوە:

(صبا)ی هەناسەم نە دەروون سەد تەرز

کەردەن کڵپەی نار ئیبراهیمی بەرز

مەولەوی قسە لەگەڵ دڵی خۆی دەکاو دەڵێت ئەی دڵ دەستم دامێنێت نەکەی تووشی نائومێدی ببی، چونکە پیاوی باش نائومید نابێت، چونکە خودا دەفەرموێت: (وَلاَ تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ) (یوسف ٨٧). کەواتە قەد باوەڕت لەق نەبێت چونکە سیفەتی جوان لای دلداران چۆن بێت وا پاداش دەدرێتەوە.

ستارەی ڕجات هەردەم دارۆ سوو

دەماخ شاد، وەبۆی، (ولا تیاسوا)

لەو ڕۆژەی خوای گەورە عەهدو پەیمانی وەرگرت لە ئادەمیزاد کە ڕۆژی (قالوا بلی)یە ئەو ڕۆژە ئێمە لە (فەنا فی اللە) تواینەوە، کەوا لەو ڕۆژەدا سەرحەلقەی خواپەرستی بوو واتە لەو ڕۆژەی خودا پرسیاری کرد ئایا من خواتان نیم؟ ئەوانیش گوتیان بەڵێ خودامانی (أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى) (الاعراف ١٧٢).

خواجەی سەر بەزمەکەی (ألست)

دەماخ وە نەشئەی بادەی فەنا مەست

لە ڕۆژی حەشردا کە هەموو کە هەموو ئادەمیزاد کۆدەکرێنەوە بۆ حساب، ئەو ڕۆژە گەلێك سەختو دژوارە، خەڵك خۆزگە دەخوازێت کە رزگاری بێت، جا بە هەرشێوەیەك بێت، لەو ڕۆژەدا تەنها پێغەمبەر(ﷺ) دێت شەفاعەتی دەکات کە دەفەرموێت (أنا لها) من بۆ ئەو کارەم جا شاعیر دەڵێت تکاکارم کە پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا تکام بۆ بکات لە حوزووری خودای گەورە، نەوەك بە ڕوورەشی بچمەبەر بارەگای خودای گەورە:

را کەرا (احمد) لوتفش بۆ جەنیم
خەجاڵەتی بەرز (کریم) نەبۆ پێم

مەولەوی دەڵێت ئێوە بۆ گلەیم لێ دەکەن لەسەر ریش تراشین، کە ئەو ریشە لەگەڵمادا نەیەتە حوزووری خودا، کەواتە هەردەبێ بیتراشم هەتا ئەو ڕۆژەی حەزرەتی ئیسرافیل فوو دەکا بە صوردا، کە فوی کرد بە صور هەموو گیانلەبەر ئەمرن، جاری دووەم کە فووی پیاکرد هەموو زیندوو دەبێتەوەو دەچنە مەیدانی حەشر بۆ حیساب کردنی لە گەلیاندا (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ) (الزمر- ٦٨)

ریشێ چەنی من نەیۆ وە حوزوور
مبۆ بتاشووش تا وە نەفخ سوور

فاتمەی بەتوول نازناوی فاتمەی زەهرایە کچی پێغەمبەر(ﷺ)و دایکی حەزرەتی حەسەنو حسین، فاتمەی بەتوول لە گوڵە بۆن خۆشەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سەیدەکانی ئیمرۆش لەنەوەی ئەو بەرێزەن دەشبێت مەبەستی شێخانی بیارە بێت زیاترە، کە ئەمانە بە رەچەلەك بە چاکی هاتونەتەوە هەروەکو چۆن دارێکی چاك رەگی لە زەویدایەو لقاوپۆیەکانیشی بە ئاسماندا چووە، ئەمەش وەکو قسەی چاك وایە، کە

هەردەم لەدەمی پیاوی چاکەوە دەردەچێت (كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ) (ابراهيم- ٢٤).

شکۆفەی وەش بۆی رەیحانەی رەسول

نەو بــاوەی نەمام (طیبه) بە توول

مەولەوی گفتی داوە، ئەم گفتەش ناشکێنێ تاکو ئەچێتە نـاو گـۆڕو سـەری لەسـەر بەردی ئەحەد دادەنێن قیامـەتیش هەڵدەسـێ دنیـا تێکدەچـێ چـیاکان وەکـو لۆکـەی پەڕەکراوی لێ دێتو هەروەکو خـودای گـەورە دەفـەرموێت: (وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ) (القارعة- ٥).

ئەو تا سـایەی بەرد، ئەو تا بۆ وەگەرد

ئەو تەمو ئەو خەم ئەو سەردی ئەو دەرد

خودای گەورە موعجیزەیەکی ئەوتوی دابووە حەزرەتی عیسا وەکـو کـوێرو بەڵـەکی چاك ئەکردەوە هەروەها مردووی زیندوو دەکـردەوە بـە ئیزنـی خـودای گـەورە (وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ).

مەولەویش دەڵێت تۆش وەرە هەروەکو حەزرەتی عیسا زیندوم بکەوە بەوەی جامێك لە شەرابم بدەیتێ کاتێك سەری کوپەو شەربە شۆر دەکەیتەوە قلپە قلپی لێوە دێت، بە شوشەی شەرابی رووت دەچێت.

بە وێنەی جاران سا پێم دەرەوە

عیسەوی ئاسـا ئیحیام کەرەوە

مەولەوی شاعیرێکی هەست ناسك بووە دیمەنی سروشتی گەلێك کاری کردۆتە سـەر هەستو نەسـتی شـاعیریەکەی، ئـەوەتا کاتێـك دلبـەرێکی نەشیلـەی جـوان دەبێـت

دەیچوێنێ بە حوریەکانی بەهەشت ئەو ئافرەتە لای مەولەوی وەکو ئـەو مانگەیـە کـە لەژێر هەوردا دێتە دەرەوە کە چۆن ڕوناك بە هەموو ڕێگا دەبەخشێ خـودای گـەورەش لە پاداشتی کردەوەی چاکی ئیمانداران لە بەهەشتدا حۆرییان دەداتێ، ئـەو حۆریانـەی لە خەیمەکانی خۆیاندا چاوەڕێی ئەو کەسانە دەکەن کە خودای گـەورە لـوتفی لەگەڵـدا کردوون (حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ) (الرحمن- ٧٢).

بە خودا قەسەم پاســـەم ئومێدەن

(حورُ مقصورات فی الخیام) تێدەن

چیرۆکی حەزرەتی یـونس پێغەمبـەر لـە قورئانـدا ئامـاژەی پێکـراوە، کاتێـك لـە قەومەکەی تووڕە دەبێت سەفەر دەکا سواری کەشتی دەبێت، پاشان فرێ دەدرێتـە نـاو رووبارو ماسی قوتی دەدا ( وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْـهِ فَنَـادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ) (الانبیاء ٨٧).

پاشان لە سکی ماسیدا تەسبیحاتی خودا دەکات ماسیەکە فرێی دەداتە کەنار روبار (أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنْ الظَّالِمِينَ) (الانبیاء- ٨٧)

لوقمەکەی ماساو قوول دەریای مەیل

لوخت سای کۆڵەی سارای دەرد لەیل

شاعیر بە شێك لە ئایەتی (و امتازوا) تێکەڵکێشی دێرە هۆنراوەیەکی خۆی کـردووە دەڵێت ساقی بانگ ڕادێرە لە مەیدانی مەحـشەر بۆئـەوەی رۆژووگـران ئەوانـەی ڕۆژوو مانگی رەمەزانیان نەگرتوە لە یەکتری جوێ ببنەوە هەردوو چۆن لە ڕۆژی دوایدا خـوای گەورە دەفەرموێت: (وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ أَلَـمْ أَعْهَـدْ إِلَـيْكُمْ يَـابَنِي آدَمَ أَنْ لاَ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ) (یس: ٥٩-٦٠).

ساقی سا ســـــــەدجار وە نازت نازوو

هوردەر وە گوڵ بانگ سەدای (و امتازوا)

لە کۆنەوە گوتراوە رۆژ بۆ کەسابەتو شەویش بۆ ئیسراحەت کاتێـك مەولـەوی لـە بەرەبەیاندا دۆستەکەیەتی، کاتێکیش ئاوا دەبێت دەبێتە مایەی حەسـانەوەی رەحـەتی دڵو دەرونی مەولەوی (معاش)و سُبات لە قورئانی وەرگرتوە لە خــودا دەفەرموێت (وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا)(النبأ- ١١)، وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا) (النبــأ- ٩).

تلووعو عرووب ســوب ئێوارانەن

مەعاشو ســەبات دەردەداران[٣]

---

٣) هۆنراوەکان لە (دیوانی مەولەوی) کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەو لەسەر نوسینی (مەلا عبدالکریم مدرس) وەرگیراوە.

# حاجی قادری کۆیی

حاجی قادری کۆیی (١٨٢٥-١٨٩٧) یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی کە شوێن پەنجەی لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا دیارە، کە هۆنراوە نیشتمانیو نەتەوەیەکانی شورشێکی کوردستانی باشوردا هەڵگیرساند.

حاجی قادری کۆیی، هەروەکو شاعیرە کلاسیکیەکانی دیکەی کورد بەخت یاوەری نەبووە تاکو بزانین لە کوێ لە ساڵی چەند لە دایك بووە.

لێکوڵەرەوانی شیعری کلاسیکی، بۆ زیاتر شارەزا بوون لەبارەی ژیانو بەرهەمی شاعیران، ناچار دەبن پەنا بۆ هۆنراوەکانی شاعیر بەرن، کە یارمەتیدەرێکی باشن بۆ ئەوەی سەرە داوێکیان دەست بکەوێت، هەروەها ڕووداو کارەساتەکانی ئەو سەردەمەی شاعیر تیا ژیاوە، ئەمیش ڕێگایەکی ترە بۆ یارمەتیدانی لێکولەرەوەکان بۆ نمونە حاجی دەڵێت:

باوکم ئەحمەد بوو ناوی فیکرم دێ

خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ

کە واتە لە ڕێگای ئەو هۆنراوەی (حاجی)یەوە دەزانین باوکی ناوی ئەحمەد بووەو دایکی فاتێ، جا ئەگەر بێتو حاجی ئەو هۆنراوەی نەوتبایە، یاخود نەگەیشتبایە دەست ئێمە نەمان دەزانی ناوی دایكو باوکی حاجی چ بووە؟ هەروەکو ئێستا نازانین ساڵی لە دایکبوونی چەندە؟

جا ئەگەر کەسێکی نزیکی حاجی قادر مێژووی لەدایکبوونی تۆمار بکردایە یاخود پاش ئەوەی خۆی کە فامی کردووەو دەستی قەڵەمی گرت بەدێرە هۆنراوەیەك مێژووی

لەدایکبوونی خۆی بنووسیایە ئەم کێشەیە لەسـەر لـەدایکبوونی پەیدانـەدەبوو. شـێخ ڕەزای تاڵەبانی لە دێرە هۆنراوەیەکدا باسی شەڕی نێوان عەبدوڵلا پاشـای بابـانو والی سنە دەکا، هەر لەم دێرە هۆنراوەیەدا بە شـێوەی ناراسـتەوخۆ مێـژووی لـەدایکبوونی شاعیر بەدیار دەکەوێت، با ئەم مێژووەی لەدایکبوونـەش یـەك دوو سـاڵێك جیـاوازی هەبێت:

کە عــەبدوڵلا پاشــا لەشــــکری والیی سنەی شــڕ کرد
ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنجو شەش تیفلی دەبستان بوو [1]

ئەم ڕووداوەی کە شێخ ڕەزا باسی دەکات، شەڕی نێوان عەبدوڵلا پاشای بابانو والی سنە، شێخ ئەو کاتـە تەمـەنی شـەش حـەوت سـاڵێك بـووە، ئەگـەر بێتـو یـەك دوو ساڵێکیش جیاوازی هەبێت ڕەنگە کـارێکی ئاسـای بێـت چـونکە ئـەو سـەردەمە لـە کوردوستاندا خوێندەواری کەم بووە، بەڵام ئە کەسانەی خەریکی لێکۆڵینەوە بووینە لە دونیای شیعری حاجی جیاوازی زۆریان هەیە لە نێوان ساڵی لەدایکبوونی حاجی قادری کۆیی، هەندێکیان مێژووی لە دایکبوونی دەگەڕێننەوە بـۆ سـاڵی (١٨١٥) زاینـی(٢) کە ئەوە لەگەڵ هەندێك لە شیعرەکانی ڕێکدەکەوێت:

سەرو ڕیشم سەراپا بۆتە لۆکـــە
شەوی هەمرازمە پشمینو کۆکە

هەروەها دەڵێت:

لەبەر پیری ئەوەندە بێ حەواسم
دەڵیی ئەرکانی ئیسلامی ئناسم

کاتێك مرۆڤ بە ساڵا دەچێتو دەکەوێتە تەمەنەوە، سەرو ڕیشی سپی دەبێتو جگـە لەمەش نەخۆشیو بێ هێزی رووی تێدەکاو خانەکانی لەش لە کەڵك دەکەون هـەروەکو منداڵی ساوا پێویستی بە چاودێری کردنی زیاتر هەیە، هەروەها پیری کار دەکاتە سـەر

هەستەکانی مرۆڤ هەروەکو ئەوەی چاوی کز دەبێت‌و گوییەکانی گران دەبن‌و زەین‌و هۆشیشی لەسەرخۆ نامێنێت زۆر بە زەحمەت شتی دەکەوێتەوە بیر، ئەم پیرییە وای لە حاجی کردووە، تەنانەت ئەرکەکانی ئیسلامیش بە زەحمەت بزانێت. ئەو کەسانەی سالّی (١٨٢٥) بە سالّی لە دایکبوونی حاجی دەزانن هەر ئەو وەسفانەی پیری لێ دێتە جێ، تەمەنەکەی حاجی دەبێتە (٧٢) سالّ، جگە لەو تەمەنە زۆرەی حاجی، کە دەربەدەری‌و ئاوارەیی‌و خەمخۆری میلەتەکەشی، زەمینە خۆش کەرن بۆ ئەوەی حاجی پیری‌و بێ حەواسی تێدا دەربکەوێ.

سەفەری حاجی‌و مەلا عەبدوللّای جەلی زادە بەیەکەوە بۆ بالّەکایەتی، زیاتر ئەم ڕایە بە هێزو پشت ئەستورتر دەکا لە بۆچونی یەکەم، چونکە وەکو روون‌و ئاشکرایە، حاجی مەلاعەبدوللّا لە سالّی (١٨٢٥)ی زاینی لەدایکبووە، ئەقلیش ئەوە قبولّ ناکات کە حاجی‌و مەلاعەبدوللّا جیاوازی تەمەنیان (٢٥) سالّ بێت‌و ببنە هاوڕێی خوێندن، گەر حاجی مەلا عەبدوللّای جەلی زادە لە سالّی (١٨٢٥) زاینی لەدایکبووبێ، بەلای کەمی دەبێت تەمەنی (١٥) بەرەو ژور بێت بۆ ئەوەی لە شوێنی لە دایکبوونی دوور بکەوێتەوە بۆ شوێنێکی دوور وەکو بالّەکایەتی کەواتە ئەو کاتە تەمەنی حاجی دەبێت (٣٥) سالّ بێت، ئەگەر لە سالّی (١٨١٥) زاینی لە دایکبوبێ، دیارە ئەم تەمەنەش ئیجگار زۆرە بۆ خوێندنی فەقێیایەتی، چونکە هەموو ژیانی خوێندنی مەلایەتی لە نێوان (٢٠-٢٥) سالّیدایە، بۆ کەسێکی وەکو حاجی دەبێت لەتەمەنی (٣٠) سالّی ئیجازەی خوێندنی مەلای وەرگرتبێت، بەلاّم گەر سالّی (١٨٢٥) زاینی بۆ سالّی لە دایکبوونی دابێنێ، ئەمە گەلێك لە راستیەوە نزیکەو هەموو (١٠) سالّێك لەگەلّ مەلا عەبدوللّای جەلی زادە جیاوازیان هەیە.

مامۆستایان کەریم شارەزاو سەردار میران لەدیوانی حاجی قادری کۆیی دەلّێن (حاجی قادر تاکو سالّی (١٨٦٢) لە ئێران ماوەتەوە، هەر ئەو سالّە ئیجازەی

مەلایەتی وەرگرتووە[٣].

ئەم قسەیە جێگای گومانو لەسەر وەستانە چونکە گەر بێتو ساڵی ١٨٢٥ز یش لە دایکبووبێت، دەبێت حاجی قادر لە تەمەنی (٣٧) ساڵیدا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتبێت، هەمدیسان ئەمەش بە ئاسانی ناچێتە عەقڵەوەحاجی لەو تەمەنە خوێندنی کۆتایی پێ هێنابێ.

د.مارف خەزنەداریش لە مێژووی ئەدەبی کوردییەکەیدا دەڵێت حاجی لە ساڵی ١٨١٦ز لە دایکبووە لە ساڵی ١٨٦٢ ئیجازەی دوازدە عیلمی وەرگرتوە[٤]، بەم پێیە دەبێت حاجی لە تەمەنی (٤٦) ساڵیدا بوبێتە مەلا، کە ئەمەش دوورە بۆ یەکێکی ئاسایی لەم تەمەنەدا ئیجازەی مەلایەتی وەربگرێت، نەك بۆ یەکێکی وەکو حاجی، هەروەها دەڵێت پاش خوێندنی باڵەکایەتی بە تەنها دەچێت بۆ ئێران شەش حەوت ساڵێك دەمێنێتەوە، ئینجا لە ساڵی ١٨٦٢ بە ئیجازەی دوازدە عیلمەوە دەگەڕێتەوە، بە گوێرەی ئەو ساڵانەی د.مارف دەڵێت (٩) ساڵی خایاندووە بەو مەرجەی پاش وەرگرتنی ئیجازەکە ڕاستەوخۆ گەرابێتەوە کوردستانی باشوور.

لێکۆڵەوەرانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی ڕێکن لەسەر ساڵی کۆچی دوایی حاجی قادری کۆیی کە ساڵی (١٨٩٧)ی زایینی، دیارە هەمووشیان پشت بەو سەرچاوە دەبەستن کە لە ژمارە سێی ڕۆژنامەی کوردستان لە ٢٠ی مایسی ساڵی ١٨٩٨ دەرچووە دەڵێ ساڵی پار واتە (١٨٩٧).

شاعیری گەورەی کورد حاجی قادری کۆیی وەفاتی کرد هۆنراوەی (زەمانە)ش لەگەڵ هەواڵەکە بڵاو کردۆتەوە[٥].

حاجی قادری کۆیی ئەو ماوەیە چ بە فەقێیاتی چ بە مەلایەتی کە لە کوردستانی ئێرانو عێراق بووە، هۆنراوەکانی لە چوارچێوەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانو ئاینی

نەچۆتە دەرەوە، بە تایبەتی ئەو کێشەیەی کە لەگەڵ شێخ نەبی ماویلی، زۆرجاران کە حاجی لە کۆیە بووە کێشەی لەگەڵ پەیدا کردووە:

لە عەهدی (کەرنەی) تا دەوری (گاکوێر)
لە گویێ ی گا نووستون زۆر حەیفە بۆ شێر

یاخـــود

پێـــی دەڵێن حیلەبازو کـــەززابە
(شێخ نەبی) خاریجـــە لە ئەم بابە

بەڵام چونکە شێخ نەبی ماویلی سەر بە شێخی تەریقەتو دەســەڵاتدار بـووە حـاجی نەیتوانیوە لە کۆیە بمێنیتەوەو درێژە بە ژیانی خۆی بدات لە مەڵبەنـدی لـەدایکبوونی خۆی کە شاری کۆیە بووە، نەیتوانیوە پارێزگاری لـە ژیـانو مـافی خـۆی بکـات، لـە بەرامبەر ئەوەش شێخ نەبی دەرهەق بە حاجی قـادر قـسووری نـەکردووە، هـەتا کـار گەیشتە ئەوەی حاجی وڵات بەجێبهێڵێ:

لە (قوشخانە) وە تا دەمی (ئیج قەلا)
لە (بایزاغە) وە تا مەحللەی (قەڵات)
هـــەموو خزمی خۆمن دەزانم دەڵێـــن
لەبێ حورمەتیمان بوو حاجـــی هەڵات

حاجی دەڵێت ئەو شێخانەی کە کەوتونەتە ڕاوو رووتکردنی خـەڵکی نـەفامو هـەژار زۆر بێویژدانانە دەیانچەوسێنەوە، خەڵکەش لە نەفامی خۆیانەوە بـە قـسەیان دەکـەن واهەست دەکەن پادشاهی رۆم عەجەم هەموو شتێکەو هەتا سەرە:

هەر شێخی کەوتە شوێنی یەك دوو کەسی رەشو ڕووت
خەڵکـــی بە موور دەزانێ خـــۆی حەزرەتی ســـولیمان
یەکتـــان نەچوونە گـــەردش واتێ دەگەن لە دنیـــا
هەر پادشـــاهی رۆمەو شـــاهی عەجەم لە تـــاران

هەروەها دەربارەی شێخو تەکیەکان دەڵێت:

ئودەبا چاکــــە لێم نەبـــن درهەم
لەم قسەو لەم حیکایەتەی دەیکەم
ئیدیعای هەر ســەنایعێك ناکــەن
تاکو نەیخوێنن ئیمتیحانێ نەکــەن
پێی دەڵێن حیلەبازو کەززابـــــە
شێخ نەبێ خاریجە لە ئەم بابـــە
خانەقاو شێخو تەکیەکان یەکســەر
پێم بڵێ نەفعیان چیە ئاخـــــــر
غەیری تەعلیمی تەتبەلی کــردن
جەمعی ئەملاكو خەزنە کۆکــردن

دیارە حاجی زۆر هاواری کردووە بۆ ئەوەی خەڵك دەستی خۆیان بکێشنەوە لە شێخ نەبی ماویلی، دیارە هەوڵەکانی بێسوود بووەو کەس بە قسەی نەکردووە ئەگەرچی حاجی ئەوکاتە مەلا بووە، بەڵام خەڵکە ڕەشوکیەکە زیاتر بڕوایان بە کەرامەتی شێخ بووە، بۆیە بوونەتە لایەنگیری شێخو دژی حاجی قادر وەستاون زۆرجاریش هەڕەشەی کوشتنی کراوە:

دەخـــیل شێخو مێخ مەبن ئەبەدا
هیچ کەسێ رزقی هیچ کەسێ نادا
ئەی خەریکـــی رموزو نازو نیـاز
ئەوروپا فەنی گەیشتوتە ئیعجـاز
قوللەیی ئیقـلی لە ئەفلاکــــــە
عەکسی ئەو گەردشی لەژێر خاکـە

ئەو بارە کۆمەڵایەتیەی کە حاجی تیا دەژیا لە شاری کۆیە، زۆر زەحمەتو دژواربوو بۆ یەکێکی وەکو حاجی کە بتوانێت بەرگەی تیا بگرێت، چونکە خەڵکەکە خۆیان دەخیلی شێخ دەکرد، وایان هەست دەکرد کە بژێوی خەڵك بەدەستی شێخەوەیە، بۆیە هانایان بۆ دەبرد، لە هەمان کاتیشدا بێئاگا بوون لەوەی کە ئەوروپا لە زانستو هونەردا زۆر پێشکەوتوو بوون، بە تایبەتی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا دروستکردنی قوللەی ئیڤل لە لایەن ئەندازیار (گوستاڤ ئیڤل)ـەوە کە لە هەموو دنیادا دەنگی دابۆوە.

حاجی قادری کۆیی پەروەردەی حوجرەو مزگەوت بووە، بیروبۆچونە ئیسلامیەکان لە هزرو بیری ڕەنگی داوەتەوە، پێشکەوتنی گەلو نیشتمانی لە ئاینی ئیسلامدا دۆزیوەتەوەو یان بە مانیەکی تر بڵێن ئاینی ئیسلامی بەچارەسەر داناوە بۆ گشت کێشە کۆمەڵایەتیەکانو چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی.

بۆ کەیە ناموسو عارو، بۆ چی یە ئیمانو دین
خاچو ئینجیلی لە جینی تەفسیرو قورئان دادەنێ
مەدرەسە دەیکاتە جێی قیسیسو ڕەهبانو کەشیش
بانگە ناقووسی لە تەکیەش پیری مەتران دادەنێ

ئیبنوئەسیر یەکێکە لە مێژوونووسە ناودارەکانی جیهانی ئیسلامی، ئیبنو حەجەری عەسقەلانیش یەکێکە لە شەرعزانەکانی ئیسلامی کە کتێبەکەی بەناوی خۆیەوەیەتی (ابن الحجر) کە جاران شەرع بەم کتێبە دەکراو فەقێکان دەیانخوێند تێدا فێری شەرعی ئیسلامی دەبوون، جا حاجی دەڵێت:

نی یە (ابن الاثیر)ێ بێتە کەمان
بەردی (ابن الحجر) بکاتە نیشان

کاك ئەحمەدی شێخ یەکێکە لە زانا بەرزەکانی ئیسلام کە خزمەتێکی زۆری موسلمانانی کردووە چ لە ڕێگای تەریقەت یاخود لە ڕێگای شەریعەت، بۆیە حاجی

دەڵێت ئێستا ئەوەی مابێت کاك ئەحمـەدی شـێخە جێگـرەوەی شـێخ مـەعروف، کـە خزمەت بە قورئانو مسوڵمانان بکات.

کەس نەمـــاوە بە غەیری کاك ئەحمەد
شەیـخی مەعرووفـو عالیمی ئەرشـەد
چاکە ئێستا دەکا لە بۆ کـــــوردان
تەرجەمەی شەرعو ئایەتی قـورئـــان

حاجی قادر گەلێك بەوە نیگەرانە کە میللەت لـە ئـاینی خـۆی دوور دەکەوێتـەوە، غەیرە دین جێگای پیاوانی ئاین دەگرنەوە وەکو دەڵێت ئەوا مزگەوتـەکان دەبنـە دێـر، لە جیاتی بانگدانی الله اکبری مزگەوتیش وەکو دێرەکان نـاقوس لێـدەدرێت، پیـاوانی مەترانی مەسیحی شوێنی قازی دەگرێتەوەو موفتیەکانیش دەبنە ڕەهبان:*

مەسجید دەبێتە دێرە ناقووسیان موئەززین
مەتران دەبێتە قازی، موفتی دەبێتە ڕەهبان

سامیری یەکێکە لە سیحربازەکانی سەردەمی موسا، داوای لە بەنی ئیسرائیل کـرد کە زێری بۆ کۆبکەنەوە، بەڵکو گوێرەکەیەکیان بۆ دروســـت بکـات، ئـەوانیش واتـە بەنو ئیسرائیل بە گوێیان کرد، ئەویش گۆلێکی بۆ دروســـتکردن، باوەڕیـان پێهێنـا، کاتێك موسا گەرایەوە نێو بـەنی ئیســـرائیل ئـەم وەزعـەی دیـت زۆر نیگـەران بـوو (فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ ۞ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلاً جَسَدًا لَـهُ خُـوَارٌ فَقَـالُوا هَـذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَـهُ مُوسَى) (طه: ٧٧-٨٨)

ســـامیری گۆسالەیە طورڕەی کە طەڕڕاری دەکـــا
ساحیری ئەصلی هەیە غەمزەی مە غەمازی دەکا

*) دیارە لەو سەردەمەدا بیرۆکەی وا هەبووە کە کوردستان بکرێتە ئەرمەنستانو موسڵمان بکرێتە دیان.

خوایْ گەورە هێزو دەسەڵاتێکی ئەوتۆی دابوو بـە حـەزرەتی سـولیمان، کـە توانـای هەبوو لەگەل هەموو گیانلەبەرێك قسە بکـات، ( يَاأَيُّهَـا النَّـاسُ عُلِّمْنَـا مَنطِـقَ الطَّيْـرِ وَأُوتِينَـا مِـنْ كُـلِّ شَـيْءٍ إِنَّ هَـذَا لَهُـوَ الْفَـضْلُ الْمُـبِينُ) (النمـل- ١٦)، یـەکێك لـەو گیانلەبەرانەی قسەی لەگەڵدا کردووە مێروو بـووە: (حَتَّـى إِذَا أَتَـوْا عَلَـى وَادِي النَّمْـلِ قَالَـتْ نَمْلَـةٌ يَاأَيُّهَـا النَّمْـلُ ادْخُلُـوا مَـسَاكِنَكُمْ لاَ يَحْطِمَـنَّكُمْ سُـلَيْمَانُ وَجُنُـودُهُ وَهُـمْ لاَ يَـشْعُرُونَ) (النمل- ١٨)، هەروەها ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان کە لـە پەنجـەی کردووە، هەموو شتێکی بۆ فەراهەم کردووە:

خەتی دەورەی ڕوخی داوە وەکو مووری سولیمانی
خـــەیاڵی کردووە زولفت بە حیلــــە خاتەمی لادا ل ٤٨

ئەو ڕۆژەی خوای گەورە عەهدو پـەیمانی لـە مرۆڤـ وەرگـرتو فـەرمووی: (الـست بربکم) مرۆڤەکانیش لە وەڵامدا گوتیان: (قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُـوا يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ إِنَّـا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِين) (الاعـراف- ١٧٢)، کەواتـە زولفـیش بـۆ ڕەتدانـەوەی لەشـکری سولتان کە خەتو خاڵە، ئەوا کەوتە سەرخاكو سەری دانا، هەروەکو چـۆن ئـەو ڕۆژەی مرۆڤـ پەیمانیدا کە جگە لەو خوایە هیچی تر نیە، ئەو ڕۆژەش ناونراوە ڕۆژی (الست):

زوڵفی بۆ دەفعی هوجوومی لەشکری سولتانی خەت
کەوتە سەرخاكو سەرکەشی دانا وەکو عەهدی الست ل ٥٧

حەزرەتی یوسف لای باوکی گەلێك خۆشەویست بوو، بۆیە براکانی ئێزەییان پـێبردو خەریکی فەوتاندنی بوون، چەند ساڵێك لە سۆزو خۆشەویـستی بـاوکی دوور کەوتـەوە، باوکیشی لەتاو دووری کورەکەی چاوەکانی کوێر بوو، بەڵام لە پـاش ئـەو مـاوە دوورو درێژە، حەزرەتی یوسف کراسەکەی خۆی بۆ نارد، باوکی فەرموو: (وَلَمَّـا فَـصَلَتْ الْعِيرُ قَـالَ أَبُـوهُمْ إِنِّـي لأَجِـدُ رِيـحَ يُوسُـفَ لَـوْلاَ أَنْ تُفَنِّـدُونِي) (یوســف- ٩٤)؛ کـاتێکیش مژدەهێنەرەکە کراسەکەی هێناو بەسەرچاوی حەزرەتی (یعقوب)یان داهێنـا چـاوەکانی

روشن بوونەوە: (فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنْ اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ) (يوسف- ٩٦)، حاجی قادریش کاتێك دەیەوێت گلەیی لە خزمانی بکات لە نەیانتوانی بەرگی لە حاجی بکەن، یەکسەر کارەساتی حەزرەتی یوسفی دێتەوە یاد:

ئەو دەمی هاتمە سەر شەکوە لە خزمو کەسی خۆم
ڕوستەمو یوسفی گوڵ پیرەهەنم کەوتەوە بیر ل ٦٤

لە شەوی ئیسراءو میعراج پێغەمبەرﷺ چووە ئاسمانەکانو هێندە لە خوای گەورە نزیك بۆوە هەتا دوری نێوان کەوانێك (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى)(النجم- ٩)، شاعیر ئەو قاب القوسین بۆتە رەمز بۆ ئەبرۆی یار:

جودایی باسی مەکە فەصڵی (قاب القوسین)ت
کەمانی ئەبرویی تۆ بوو لەبەزمی خاصی عەلیم ل ٨١

لولاك ئاماژەیە بۆ ئەو حەدیسە قودسیەی کە دەفەرموێت: (لولاك لولاك لما خلقت افلاك)، واتە: گەر تۆ نەبوای دنیامان دروست نەدەکرد، هەروەها (ارسلناك) ئاماژەیە بۆ ئەو ئایە قورئانیە: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ) (الانبیاء- ١٠٧)، ئەم دوو فەرموودەیە دەربارەی گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) گوتراوە، کەواتە هێندە بەسەر خاوەنی جەلالو کەمال کە خوای گەورەیە باسی گەورەیی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) بکات:

خەلاتی عیززەتی (لولاك)و تاجی (ارسلناك)
بەسە ثەنایی جەلالو کەمالی خوڵقی عەظیم ل ٨١

پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی کۆتایی شەفاعەت بۆ ئومەتی خۆی دەکا بە ئیزنی خوای گەورە، جا گەر بێتو تۆ شەفاعەت نەکەی، من دەچمە دۆزەخ گەر بێتو هەردەم لە ژێر ئیحرام دابم:

بەبەر شەفاعەتی خۆتی ئەگەر نەخەی (حاجی)
لیباسی کەعبە لەبەرکا دەبێ بچێتە جەحیم ل ٨٢

کێوی طور ئەو کێوەیە کە حەزرەتی موسی سەلامی خوای لێ بێت، داوای لە خوا کرد کە بیبینێ خوای گەورە فەرمووی ناتوانی ببینی، بەڵام سەیری ئەم کێوە بکە نووری خۆم پیشانت دەدەم کاتێك موسی نورەکەی دێت لەهۆش خۆی چوو (قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنْ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا) (الاعراف- ١٤٢).

لەسەر طووری ڕوخت مووسا کە فیرعەونی خەتی لادا

لە سیڕڕی زاری تۆی پرسی جەوابی (لن ترانی) بوو ل ١٠٢

حەزرەتی (یوسف)یش بەهۆی خۆشەویستیەکی زۆری باوکیەوە، براکانی ئێرەییان پێبرد بە پیلانێك هەڵیاندایە ناوبیر (فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ وَأَجْمَعُوا أَنْ يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ) (یوسف ١٥)، پاشان کاروانێك هات بۆئەوەی ئاو لە بیرەکە دەربهێنێ دیتیان منداڵێك لەناو بیرەکەیە (وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ فَأَدْلَى دَلْوَهُ قَالَ يَابُشْرَى هَذَا غُلَامٌ وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ) (یوسف- ١٩).

مەگەر بیستوویەتی خەططت لە نێو چاهی زەنەخدانت

ئەسیری یووسفە بۆیە نزوولی کاروانی بوو ل ١٠٢

ئەو موعجیزەیەی خوای گەورە بە حەزرەتی موسای دابوو، هەرکاتێك دەستی لە باخەڵیا دەناو پاشان دەریدەهێنا دەستی سپی دەبوو دەدرەوشایەوە (وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْرَى) (طه- ٢٢).

(حاجی) دەڵێت ئەوشتەی خۆت کە هەتە ئاشکرای مەکە چونکە ئەو هێڵەی کە هەیە لە مابەینی یەهودیەکان وەکو شەڕی بەدرو حونینە کە شەری بەدر لە ساڵی (٢ك) لە نێوان موسلمانەکانو کافرە قوریشیەکان بوو، شەری (حونین)یش لە نێوان موسڵمانو هۆزی هوازین ثقیف رویدا لە ساڵی ١٥ کۆچی.

ظاهر مەکە دەلالەتی بە مووسای یەدی بەیزات

بۆ حەنتی یەهوودی کە شەڕی بەدرو حونینە ل١٢٢

شەوڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) لە شاری مەکە بۆ قودس وە لە وێشەوە بۆ ئاسمانەکان بەڵگەی قورئانی هەیە (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (الاسراء- ١)، بەهاوڕێتی جوبرائیلی ئەمینە تاکو گەیشتنە (سدرە المنتهی) ئیتر لەو شوێنە جوبرائیل گوتی: توانم نیە، (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى) (النجم: ١٣-١٤)، حاجی قادریش هەر ئەو باسە دەوروژێنی کە پێغەمبەر(ﷺ) توانی ڕۆیشتنی زیاتری هەبووە لە سدرە المنتهی بەڵام جوبرائیل لە ڕێگا وەستاوو توانای لەوە زیاتری نەبوو.

شەوی میعراجی سوبحانە بەقەدری سەروی تۆی زانی

لە (سدرە) جوبرئیل بۆیی لە نێوەی ڕێگە لایداوە ل١٢٧

شەیتان کاتی خۆی داوای لێکرا سەجدە بۆ ئادەم ببات، کەچی شەیتان یاخی بوو سەجدەی نەبرد، پێی گوترا بۆ سەجدە نابەی؟

لە وەڵامدا گوتی من چاکترم لە ئادەم چونکە من لە ئاگر دروست کراومو ئەو لە قوڕ (فَسَجَدَ الْمَلاَئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ، إِلاَّ إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ، قَالَ يَاإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَاسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنْ الْعَالِينَ، قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ) (ص- ٧٥).

کاتێك شەیتان محرابی برۆی دیوە، لەم کارەی خۆی پەشیمان بوتەوە، کە بۆ چ سەرپێچی لە سەجدە بردن کردووە.

کە شەیتان تاقی میحرابی برۆی تۆی دی گوتی (یارەب)

لە سەجدەی حەزرەتی ئادەم سەری خۆم بۆچی باداوە ل١٢٧

(الست) ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە عەرزی بنی ئادەمی کرد (الست بربكم) لە وەڵامدا گوتیان (قالوا بلى).

حاجی قادر شیکایەت دەکات لەدەست شکاندنی جامی مەی، کەچی ساقی

هەروەکو ڕۆژی (الست) پەیمانی داوە حاجی مەی هەردەم پڕ بکات:

ساقی کەریمە بادەی بەزمی (الست)
حاجی لە جامی قەلبی شکاوە شیکایەتی ل١٥٨

حاجی قادر کۆیی زۆر بە تەنگ پێشکەوتنی وڵاتەکەیەوە بووە، چاکیشی زانیوە تەنها ڕێگای پێشکەوتن لەڕێگای خوێندنو خوێندەواریەوە دەبێت، لێرەدا حاجی وەکو کەسێکی موسڵمانو بڕوا پتەو هانی خەڵکی ئەدا بۆ خوێندن، بەڵگەشی ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (اطلب العلم ولو بالصين).

ڕەنگە لە سەردەمی حاجی قادر کەسانێك هەبووبن دژی خوێندەواری بووینە خوشیان بە موسڵمان زانیووە، حاجی قادر بۆ دەمکوت کردنیان ئەو فەرموودەیەی هێناوەتەوە کە ئاینی ئیسلام یەکەمین هاندەرە بۆ وەدەست هێنانی زانستو زانیاری گەر لە دوورترین شوێن بێت:

بۆچی فەرموویەتی نەبی یی ئەمین
اطلبوا العلم ولو بالصين ل ١٨٦

کاتێك نوح پێغەمبەر لەگەلەکەی بێزاربوو داوای لە خوای گەورە کرد لەناویان ببات (وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لاَ تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنْ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا) (نوح- ٢٦)، خوای گەورەش فەرمانی پێکرد کەشتیەك دروست بکات برواداره‌کانو لە زیندەوەرانی تر نێرو مێیەك هەڵبگرێ لەگەڵ خۆیدا لەناو ئەو کەشتیە، (قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ)(هود- ٤٠)، حاجی قادری کۆیی ئەم بەسەرهاتە وەکو چیرۆك بە شێوەی هونراوە دەگێڕێتەوە:

ئەو ڕۆژە بە ئەمری حەبیبی مەننان
ئەم عالەمە پاکی بوو بە تۆفان
دەبیاری نەما لە جینسی ذی ڕووح
غەیری ئەمە هاتە کەشتی یی نووح ل ١٩٥

حاجی قادری کۆیی هەلساوە فەرموودەیـەکی پێغەمبـەری(ﷺ) تێکەلکـشێ دێـڕە هونراوەیەکی خۆی کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (حب الوطن من الایمان):

ئارێ بە حەدیثو نەصصی قورئان

حوببـــی وەتەنە دەلیلـــی ئیمان ل ١٩٦

سەرچاوەکان:


١- دیوانی شێخ ڕەزای تالەبانی / شەرحو لێکۆلینەوەی شوکر مستەفا / دەزگای ئاراس.

٢- عەلائەدین سەجادی، مێژووی کوردی، چ ١، بەغدا ١٩٥٢، ل ٢١٠، منیش لە دیوانی حاجی قادری کۆیی (کریم شارەزا، سردار میران) وەرمگرتووە.

٣- دیوانی حاجی قادری کۆیی / کەریم شارەزا، سردار میران، پێداچونەوەی مسعود محمد، ١٩٨٦، ل ١٢.

٤- مێژووی ئەدەبی کوردی ، ب ٤، ل ١٢٠، د.مارف خەزنەدار.

٥- ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٣، ١٨٩٨/٥/٢٠، هەموو سـەرچاوەکان لەو ڕۆژنامەیان وەرگرتووە.

# ڕەهــەندی ئـایــین لە شـیعری مەحـــوی

مەحوی (١٨٣٢-١٩٠٦) یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی کورد، کە شوێن پەنجـەی لە ئەدەبی شیعری کلاسیکی کوردیدا دیارو بەرچاوە، هەروەها یەکێکـە لـەو شـاعیرە کوردانەی کە دەتوانین بڵێین هـەقی خـۆی دراوەتــێ کـە دیوانەکـەی بـە لێکۆڵینـەوەو لێکدانەوەیەکی تێروتەسەلو گێرانی کۆڕو ڤیستڤالو نوسینی نامەی دکتـورای لەسـەر کراوەو نوسراوە.[1]

وەکو ئاشکرایە لای هەموو ڕۆشنبیران، مەحوی لەو بارو زروفـەی سـەردەمەی تێـدا ژیاوە خوێندنی حوجرەو مزگەوتەکان باوی هەبووە، (مەحوی) یش وەکو هەر کەسێکی دیکەی سەردەمەکەی خۆی چۆتە حوجرەو فرچکی بـە خوێنـدنی زانـستەکانی ئاینـەوە گرتووە، سەرەرای زانستەکانی ئاینی لـە خێزانێکـی ئاینپـەروەری صـوفیدا پـەروەردە بووە، مەلا عوسمانی باوکی خەلیفە شێخ عوسمانی تەوێڵە بووە، خۆشی خەلیفەی شـێخ بەهائەدینی کوڕی شێخ عوسمان بووە.

گومان لەوەدا نیە (نالیو سالمو کوردی) بە سێکوچکەی قوتابخانەی شیعری بابان لـە قەڵەم دەدرێن، کاتێکیش باس لە کەڵەشاعیرێکی تری ڕێبازی کلاسیکی کوردی وەکـو مەحوی دەکەین کە بە یەکێك لە تەواوکەرو درێژەپێـدەری قوتابخانـەی شـیعری بابـان دەژمێردرێ، مەحوی سی سـاڵێك پـاش نـالی هاتۆتـە دونیـاوە، لـە ئـاخرو ئـوخرەی ئەمارەتی باباندا ژیاوە، بە رووخاندنو لەناوچوونی ئەمارەتی بابان نیگەران بووە:

لە دەوری دڵمی کە دێ ئەم هەموو غەمو تەعەبە
دەروونی کەیلـــە لە زووخاوو دەردو تا بە لەبـــە

وتی: ببـــێ دڵە! وەك تۆ خەراب و شـــیفتە حاڵ
بەڵـــێ هەیـە لەمن ئاشـــفتەتر: ولاتی بەبـــە ل ٣٥٣

مەحوی گەلێك ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکی سولێمانیو دەوروپشتی بەچاوی خۆی بینیوە، ئەو ڕۆژگارەی کە مەحوی تێدا ژیاوە شاری سولێمانی ببووە مەیدانی ناکۆکیو زۆرانبازی نێوان بەرەی هەقو ناهەق، بەڵام مەحوی وەکو شاعیرێکی جەربەزە هیچکاتێك ئامادەی ئەوە نەبووە مەیدان چۆڵ بکاو سەری ئاوارەیی خۆی هەڵبگرێو خۆی لە ئێشو ئازاری نەتەوەکەی بدزێتەوە، بەڵکو کەوتۆتە ململانێیەکی سەختەوە لەگەڵ بەرەی ناهەقدا، بە پێچەوانەی گەلێك لە روناکبیرانی سەردەمەکەی خۆی کە نەیانتوانی یاخود چاویان بەرایی نەهات میرنشینی بابان بەم شێوە ببینن.

هەرچۆنێك بێت ئەگەر ئێمە بمانەوێ لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەسەر شیعری مەحوی بکەین ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەوێت، چونکە شیعری مەحوی هەمەلایەنەیە (ئاینی، سۆفیزمی، فەلسەفە، کۆمەڵایەتی...تاد) لە هەموو لایەنەکانیشدا شیعری بەهێزی وتووە، بێخودی شاعیر دەڵێت (شیعری مەحوی چەکوش کاریە قوورسەو داخراوە، ئەبێ زۆر لێی وردبیتەوە، ئەبێ تەماشای کتێبی بۆ بکەی، ئەبێ لە شەرحەکانی حەدیسو تەفسیری قورئانو زانستەکانی ئاینیو شاعیرە گەورەکانی فارسی شارەزا بین[٢]).

ئەمە وامان لێ دەکات کە بڵێین هیچ شاعیرێکی سەردەمی مەحوی لە ڕووی فەلسەفەو بیری قووڵو ورد شیعریان وەکو مەحوی نەگوتووە.

مەحوی لەبەرئەوەی دەرچووی حوجرەو مزگەوتەکانە، بە ڕونوئاشکرا ئاینو کەلتوری ئیسلامی لە شیعرەکانیدا، ڕەنگی داوەتەوە، جا شارەزا بوونو ئاشنا بوونی بە میراتی کەلەپووری مەحوی کە هەڵقوڵاوی زادەی بیری سەردەمەکەی بووەو سود وەرگرتنی لە کەلەپوری ئاینی ئیسلامیو بەستی هەردوو جەمسەری بەیەکەوە.

جا وەنەبێت کە دەڵێن مەحوی ئاینو کەلەپوری ئیسلامی لـە هۆنراوەکـانی ڕەنگـی داوەتەوە، لایەنەکانی تری وەکو (کۆمەڵایەتی، سیاسی، تاد) فەرامۆش کردبێت، بەڵکو دیوانی مەحوی پڕە لە شیعری هەمە جۆر:

وتی: میوەی بەهەشتە شیعری مەحوی
خودا نەبـڕی لە باغـم داری بـەردار   ل ١٢٠

لێکولەرەوە کاتێك لێکۆڵینەوەیەك لەسەر شاعیرێك دەکات، ناچار دەبێـت پـەنا بـۆ شیعرەکانی دەبات، چونکە ئەوە دەبێتە یارمەتیدەرێکی باش بۆ لێکۆڵـەرەوە جـا بـەم پێیـە دیـوانی مـەحوی پـڕە لـە شـیعری ئـاینیو سـوفیزم، بۆیـە ئـەو لێکۆڵەرەوانـە سوفیزمیان کردۆتە دەروازەیەك بۆ چونە نێو دونیای شیعری مەحوی، کەواتـە مـەحوی شاعیرێکی سۆفیە بەمانای وشە، بەڵام گەلێك جاریش وا دەبێت مەحوی تـوانجو پـلار دەگرێتە ئەو کەسانەی ئاین دەکەنـە پەنایـەك بـۆ ئـەوەی مەرامـەکاتی خۆیـان تێـدا بشارنەوە، گەلێك جاریش دەبینین خـودی سـوفێتی خۆشـی پروشـکی تانـەو تەشـەری بەردەکەوێ:

شێخێ هەمەوەندێکی دەدا پەندو نەصیحەت
ئەو قوربەسەرەی دابوە بەر فەحشو فەضیحەت
خـۆش هـاتە جوابو وتی حەقتە، فەقەط من
قوططاعی طەریقم نەکـو قوططاعی طەریقەت   ل ٣٣

مەحوی لە ڕۆژێکی خراپدایە، زیاتریش شاعیر دەست بەدوعـایە لەبەر ئەو کەسـانەی کە هەردەم چاکەیان لەگەڵ دەکا، پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفـەرموێت: (اتـق شر من احسنت اليه) ئەی ئەوە نیە خەلیفەی یەکەمی موسڵمان ئەبوبەکری صدیق ﵁ هەردەم چاکەی لەگەڵ مەسطەحـی پـوورزای دەکـردو مەسـرەفی دەکێـشا، هـەر ئـەو مەسطەحە گەورەترین بوختانی بە کچی ئەبوبەکر کردوو کە دەکاتە حەزرەتی عائشەی

خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕووداوی ئیفك[٣]:

هەر ئەو کەسە کە خەیری دوعای خێری دیوە لێم

دائیم دوعامە شەڕڕێ لەمن لابدا خودا          ل ٤

مەحوی گەلێك پەرۆشە بۆ برایانی خۆی کە ڕێگای خۆشەویستی خوایان ونکردووەو ڕێگای ڕاستیان لێ گۆڕاوە، جا مەحوی هەڵساوە ئایەتێکی قورئانی (اقتباس) وەرگرتووە کە دەفەرموێت: (وَالسَّلَامُ عَلَى مَنْ اتَّبَعَ الْهُدَى) (طە- ٤٨)، واتە: سلاو لەسەر ئەو کەسانەی کە شوێن هیدایەتو ڕێبازی ڕاستەقینە کەوتوون:

بۆ گوم بوانی چۆلی مەحبەتیەتی، خودا

تەبشیری (والسلام علی تابع الهدی)          ل ٥

مەحوی وەکو مرۆڤێکی باوەڕ بەخوا، هەموو ئیشێکی کە دەیکا پشتو پەنای بەخوا بەستووە بۆ هیچ پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتووە کە ئەو دەردوو بەلایانەی لە دونیا تووشی دەبێت.

شێخی سەعدی لە هۆنراوەیەکدا دەڵێت کە مەلا مستەفای صفوەت کردوویە بە کوردی:

قایە دیواری ئومەت تۆی هەبێ بۆ پشتیەوان

کێ غەمیەتی نوح ببێتە کەشتیەوان

جا مەحوی شاعیر سوودی لەم ئایەتە وەرگرتوە کەخوا دەفەرموێت: (وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا) (الطلاق- ٣)،

موستەغنیە لە مەننی سەفینەو سەفینەوان

هەرکەس کە ئیشی هەر بەخودا بێ، نە ناخودا          ل ٦

لەسەردەمی ژیانی مەحوی، زۆر ناهەقی کراوەو گوتراوە بەرامبەر بە خەڵکەکە بۆیە مەحوی نەیتوانیوە بەرامبەر ئەم هەموو ناهەقیە بێ دەنگ بێت، چونکە مرۆڤی حەق

خواز هەرچەندە دان بە خۆیدا بگرێـت ناتوانێـت هەتاسـەر لـە قـسەیەکی نـاڕەوا یـان کارێکی نابەجێ بێدەنگ بێت، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفـەرموێت (قـل الحـق ولـو علی انفسکم) مەحویش دەڵێت:

هەتا حەق ناصیرە، هەر هەقمە مەنظور
وەکوو (مەنصور) ئەگەر بـمکەن بە دارا ل ٨

مەحوی دەپاڕێتەوە لە خوای گەورە، کە (عفـو) یەکێکـە لـە سـیفەتەکانی خـوای گەورە، دەڵێت ئەی خوای گەورە عەفوم بکـە لەبـەر خـاتری جـاهی پێغەمبـەر(ﷺ)، ئیشارە هەیە بە دوو ڕوەکانی مەدینە کەهاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) بیانویـان هێنـاوە، کە ناتوانن ئامادەی جەنگ بن لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ).(عَفَا اللَّهُ عَنْـكَ لِـمَ أَذِنـتَ لَهُـمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ)

عەفوم کە (یا عفو) بەحەق جاهی ئەو شەهە
ئایەی عولووی جاهی ئەوە ئایـــــەتی (عفا) ل ١٢

پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) لە کتێبەکانی ئاسمانیدا، ناوی هاتوە بـە ئەحمـەد، کاتێـك عیسا پێغەمبەر(ﷺ) بە لایەنگیرانی خۆی دەڵێت، پاش من پێغەمبـەرێکی تـر دێـت بـەناوی ئەحمـەد بـڕوای پـێبهێنن، ئـەو پێغەمبـەرە هەڵبـژێردراوی خوایـە لەلایـەن فریشتەکانی خوا بەناوبانگە بە مەحمود، دیارە ئەحمـەدو مـەحمودیش هەریـەکن. (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَابَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ مُـصَدِّقًا لِمَـا بَـيْنَ يَـدَيَّ مِـنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَـدُ فَلَمَّـا جَـاءَهُمْ بِالْبَيِّنَـاتِ قَـالُوا هَـذَا سِحْرٌ مُبِينٌ) (الصف- ٦).

مەحموودی (فی السما) یە، حەبیبی خودایە ئەو
مەقبولی بارەگـــاه، ئەو موختارەو موصـطەفا ل ١٢

مەحوی لەتاو دووری یارەکەی تووشی چاوئێشە بووە، بەڵام بەهاتنی تـۆزی ڕێگـای بەرپێی چاوئێشەکەی نەما، هەروەکو چۆن حـەزرەتی یـەعقووب لـەتاو دووری یوسـفی

کوڕی چاوەکانی کوێر بوو، بەڵام کاتێك کراسەکەی یوسفیان هێناو بەسەر چاویان دادا.چاوەکانی چاك بۆوە، (فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنْ اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ)(یوسف- ٩٦):

یەعقوب- وەش کە (مەحوی) یە چاو تیشەداری هیجر

چاوی بە گەردی ڕاهی بەشیرت گلی شکا ل ٢٢

شەهید کەسێکە نە دەشۆری نە نوێژی مردووی لەسەر دەکرێت ئەوە دۆستی مەحوی کە مەولەوەیە مردوو، لە ئاسماندا وشەی الصلا دەنگ دەداتەوە دەڵێت بە فریشتەکان ئامادەبن بۆ نوێژی جەنازە، چونکە شەهید مەلائیکە نوێژی لەسەر دەکا:

وەقتی نوێژی سەرجەنازەی بۆ شەهیدی عیشق دۆست

مەوج ئەدا ئەم ئاسمانە لە دەنگی (ألصلا)

لە ساڵی ٤١ کۆچی کارەساتێکی دڵتەزێن روویدا لە جیهانی ئیسلامیدا ئەویش شەهید بوونی حەزرەتی حوسێن بەدەستی لەشکری یەزیدی کوری معاویە، کاتێکیش شاعیر شوێنی کوشتنی دڵدارەکانی خۆی دیت وتی من یەزیدم ئەو شوێنەش کەربەلای دووەمە، کتێبەکانی مێژووش ئەم بەسەرهاتە باشتر روون دەکەنەوە:

تورکی من کوشتارخانەی عاشقانی دی، وتی

من (برنجی بر یزید) ئێرە (ایکنجی کربلا) ل ٢٩

دونیا پیاوی تیا نەماوە، ئەم دونیایە جێگای مرۆڤی مەردی تیا نابێتەوە، ئەی ئەوە نیە مەنصوری حەلاج دەکرێ بەداراو یونس پێغەمبەریش ماسی قووتی دەدا.

کاتێك یونسی پێغەمبەر(ﷺ) سواری بەلەم دەبێت، پاشان فرێی دەدەنە ناو ئاو ماسیەك (النون) قوتی دەدات، پاشان بەهۆی تەسبیحاتی یونس پێغەمبەر(ﷺ) ماسیەکە فرێی دایە کەنار ڕووبار (وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ

فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنْ الظَّالِمِينَ) (الانبياء ٨٧)،

قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە، دەبینی مەنصور
بەسـەری دارەوە (ذالنـون)ـە لەبن زینـدانـا ل ٢٤

خدری زیندە واتە خضر، کۆمـەڵی زانـا ئاینیـەکان باوەڕیـان وایـە کـە ئـەو بەنـدە مەشهورە بە (خضر)و، بە گوێرەی ئەوەی لە حەدیثەوە دەرئەکەوێ، بەتایبـەتی ئـەوەی کە بوخاریو طـەبری ئەو ریوایەتەیان کردووە لە حەزرەتەوە(ﷺ) کە ئـەو بەنـدە کاتـێ دادەنیشت لەسەر عەرزی سافی سپی گیای لێ ئەڕواو سەوز ئەبو، جا لەبەر ئەمـە بـو ناوبراو بە (خضر)[٤]، واتە بەردەرگای ئەو لە بەردەرگای هیچ کـەس ناچـێت، خـەڵکی مالی لە نزیك ئاوە هی ئەو لەسەر ئاوی حەیاتە، خەڵکی بەردەرگای هەموو دڕکە هـی ئەو دڕکی وەکو گول وایە، لەناو کوردەواری وا باوە خـدر ئـاوی حـەیاتی خواردۆتـەوە هەتا رۆژی قیامەت نامرێ:

ئاوی (خضر)ـە خاکـی ئەو بەرقاپییە
دڕکی ئەو بەردەرکە گوڵ، پووشی گیا ل ٣٩

هەرکاتێك شاهی دلبەران فەرمانی دەرکرد کە دەفتەری خۆی بخوێنێتـەوە، جـا ئـەو دەفتەرە چی تێدا بێت کەس ناتوانێت نکوڵی لێ بکـات نەیخوێنێتـەوە گـەر فـەرمانی کوشتنیشی تێدا بێت، لە ڕۆژی قیامەت هەرکەس دەفتەری خۆی وەردەگرێتەوە خـوای گەورە دەفەرموێت خۆتان دەفتەری کردەوەکانتان بخوێننەوە بـزانن چـی تێدایـە؟ (اقْـرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا) (الاسراء- ١٤):

کە ئەمـری فەرمو ئەو شاهە بە (اقراء)
ئەگەر فەرمانی قەتڵە کـێ دەڵێ نەء؟ ل ٤٠

کاتێك خوای گەورە پرسیاری لە حەزرەتی موسا کردو فەرموی ئەوە چیە بەدەسـتی ڕاستەوە؟ ئەویش عەرزی کرد ئەوە عەسای خۆمە کاتی کە مانـدوو بـووم یـان بـەلای

ئاژەڵەکانمەوە وەستام خۆم ئەدەم بەسەریا وە گەلاداریشی پێدا ئەوەرێنم چەند ئیشی تری پێدەکەم (وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَامُوسَى، قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى) (طه: ١٧-١٨)، (مەحوی)یش دەڵێت منیش خۆم ڕاگرتووە بەقەد باڵای یارم ئەونەبێت ناتوانم خۆم ڕاگرم ماوەی ژیانم نەماوە:

بەیادی قامەتی ماوم بەپێوە

علی ما مثلها موسی توکا ل ٤١

شەرەفو گەورەیی بە زانستە، لەبەر گەورەیی ئەو زانستە خوای گەورە لە یەکەم ئایەتیدا بە (اقراء) دەستی پێکردو بەسەر پێغەمبەری(ﷺ) دابەزاند (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق- ١)،

شەرەف هەر عیلمە، نابینی کە ئەشرەف

موشەڕڕەف بوو بە ئەمر ئەووەڵ بە اقرأ ل ٤٢

مەحوی گلەیی لەو مامۆستایە دەکات کاتێك بەدەستەکانی لەو قوتابییەی داوە، کەواتە ئەو دەستە برزی وەکو دەستی ابولهب کاتێك بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کرد قسەی ناشیرینی پێگوت، کەواتە دەستی ابولهب وشك بێت وەکو وشك بوو (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ) (المسد ٥):

زڵلەی موعەللیم ئەو گوڵی ڕوومەتیە خستە تەب

(تبت يدا ابي لهب)ی بێئەدەب (وتب) ل ٦٤

یارم ئازاری دام بەهۆی کەسەکانی دەوروبەری کە هەموویان فتنە ئەگێڕن ئەو فتنە چیانە ئاگری دۆزەخ خۆش دەکەن، هەروەکو چۆن خاوەنی حمالە الحطب کە خێزانی (ابو لهب)ـە دڕکی ئەگواستەوە بۆ سەر ڕێگای پێغەمبەر(ﷺ): (وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ، فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ) (المسد- ٥):

ئازاری دامو هەرکەسە کردی لە گردی خۆی

هێزم کەشی جەهەننمە (حمالة الحطب) ل ٤٧

مەحوی کوشتەی دەستی یارەکەیەتی، پـاش ئـەوەی دەیکـوژێ ئیمانەکەشـی دەبـا (پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (من قتل قتیلا فله سلبه)) هەرکەسـێك یـەکێکی کـافر لەشەڕدا بکوژێت کەلو پەلەکەشی بۆ خۆی دەبات:

هەم دەمکوژێتو دینو دلێشـــم دەبا، دەڵێ

من (من قتل)، ئەمیشە قەتیلم (لی السـلب)    ل ٤٩

رافیـضیەکان تیرەیەکن قسەی ناشیرین بە حەزرەتی عائشەی دایکی موسڵمان دەڵێت دەربارەی رووداوی (ئیفك)، (تەماشای سورەتی النور بکە)، مەحویش دەڵێ من وەکـو حەزرەتی عائشە وام هەرچەندە خەلکی قسەی خراپم جنێوم پێ بدەن ئەوا من بە هـیچ شێوەیەك وەلامیان نادەمەوە:

ئەگەر واعیظ دوصەد طەعنە بدا، طەعنێکی لێ نادەم

ئەگەرچی موستەحەققی لەعنە، با بو ڕافض بێسـەب    ل ٥٠

فەجری کـاذب زاراوەیەکی شـەرعیە کاتێـك بـەری بـەیان رونـاك دەبێـت، خـەلکی واهەست دەکات بەیانیە، بەلام پاشان دونیا تاریك دەبێتەوە، ئێمە بـە خۆمـان دەلـێین پیاو، خوای گەورەش بەو کەسانە دەلێ پیاو کە کرینو فرۆشتن ناتوانێت خوایـان لـەبیر بباتەوە، ئەوانە پیاون ئێمەش بەناو پیاوین هەروەکو فـەجری کـاذب و فـەجری صـادق هەردوکیان پێیان دەگوترێ بەیانی (رِجَالٌ لاَ تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلاَ بَيْعٌ عَـنْ ذِكْـرِ اللَّهِ وَإِقَـامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالأَبْصَارُ) (النور- ٣٧)

بەناو ئێمـــەش ڕیـجالیـــن و، ریـجالـــی (هـــم رجال) هـــەم

بە فەجری ناو دەبەن، صەد حەیف، ئەگەر صادیق، ئەگەر کاذیب    ل ٥٤

مەحوی دەلێ حەیفە موسـلمانی ئیمانـدار لـە خـوای خۆی غافـل بێـت گـەر بـۆ ساتێکیش بێت، چونکە دلی موسلمان عەرشی خوایە (قلب المومن عرش الرحمن):

دلە عەرشی خودا (مەحوی) خەجالەت بە لەبەر غەفلەتی

کە بۆتە بوتکەدەی بێبەرهەمـــەن یا دەربری بێ راهیـــب    ل ٥٥

مەحوی زۆر بێزارە لە سەردەمەی خۆی کە مرۆڤ خراپ هەیە وەکو شـەیتان ئـاژاوە دەگێڕیو ئازاری دڵی خەڵکی دەدەن، یەکێك لەوکەسانە مەحوی شاعیرە، بەڵام مەحوی گوێیان پێ‌داناو حەواڵەی خوایان دەکات چونکە مەحوی ئیمانـدارەو خـوای بەسـە کـە یارمەتی دەرو پشتیوانێکی چاکە (حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ) (آل عمران-١٧٣):

بەو خودایەو بەس، لە شـــەیطانی شەقی مەحوی پەناه

بەس لە غـەدری شەیطەنەت پیشەوە بە بەرکەس شکات　　　ل ٦١

خضر ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت نامرێ، مەحوی دەڵێ من وەکـو خضر نیمو چاو ببرمە ژیان، من هەر ئەوەندە دمەوێ بژیم هەتا دەگەمە دەرگای یار:

(خضر) ئەگەر چاوی حەیاتی برییە ئاوی حەیات

من لە خاکی دەری جانانەمە هەر چاوی حەیات　　　ل ٦٣

مەحوی دەڵێ نەفسی مرۆڤ بێ‌دەسەڵاتە، جلەکانی خۆی لێ بەڵایـە ناتوانـێ کـاری خۆی بەرێوە ببا چ جای ئەوە ئەو ئەمانەتە گەورەیە کە (قورئانـە) هـەڵبگرێ، چـونکە کاتی خۆی داوا لە ئاسمانو زەوی کرا کە ئـەو ئەمانەتـە بگرنـە ئەسـتۆ، بـەڵام شـانی خۆیان نەدابەر، مرۆڤ خستیە سەر شانی خۆی بەوەش زوڵمێکی زۆری لەخۆی کرد (إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَـةَ عَلَـى الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَـالِ فَـأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَـا وَأَشْـفَقْنَ مِنْهَـا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً) (الاحزاب- ٧٢)،

لەبەر باری مەحەببەت ئاسمانو ئەرز ئەناڵێنـــــن

چیە ئەم دەعوییەت زاهید، جلی لێ بارەگا پیرت

مەحوی شاعیر ئامادەیە دەستی بەیعەت لەناو دەستی کەسێك بنێـت کـە شـایەنی ئەو بەیعەتە بێت، ئیتر من چ پێویستم بە موعجیزەی حەزرەتی عیسا هەیە کە مردووی زیندو دەکردەوە (وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَـوْتَى بِـإِذْنِ اللَّـهِ) (آل عمـران- ٤٩)،

یاخود کاتێك حەزرەتی موسا دەستی لە باخەڵیا دەنا دەستی سپی دەبوو (وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْرَى) (طه- ٢٢).

بەدەستی غونچە دەمێ، دەستی دا کە بەیعەت بۆم
چ ئارەزوومە لە (عیسـا) دەمو لە (موسـا) دەست    ل ٧١

زەمزەم ئەو بیرەیە کە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ، خەڵکی ئاوی لێ دەخواتەوە، ئەم بیرە لە سەردەمی (حەزرەتی ئیسماعیل)ـەوە هەیە، خـەڵکی ئێـستاش کاتێـك دەچـنە حـەج هەندێکی لەگەل خۆیان دەهێننەوە بۆ موتفەرك، مەحوی دەڵێ زەمزەم بـەو پیرۆزیـەی خۆی ناتوانێت ئەو شتە خاوێن بکاتەوە:

زەمزەم چیە، بە زەمزەمەی ئایاتو صەد حەدیث
پابونەوە لە شـەئنی نیە طیفـەتی خەبیـث    ل٩٠

مەحوی دووریو نارەحەتی دڵدارانی بەرۆژی حەشـر لێکداوەتـەوە، کـە لـەو رۆژەدا چەند ڕوخسارێك خەجاڵەتو ڕەنـگ زەردو شـەرمەزار دەبـن (مـەحوی ئـەم ئایەتـەی وەرگرتـووەو تێکـەڵی ئـەم دێـڕە هۆنراوەیـەی کـردووە: (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) (الغاشية- ١).

ئەهوالی ڕۆژی فیرقەتو ئەحوالی عاشقان
لـەو ڕۆژەدا موطابیقیە (هل اتی حدیث)    ل ٩٠

(قابیلو هابیل) هەردوکیان کوڕی حەزرەتی ئادەمن، بەڵام ئەو دوو کوڕە، دەسـتیان بە کوشتنی یەکتری کرد، ئەوە بوو قابیل هابیلی برای کوشت ئەمەش یەکەم مرۆڤە کە خوێنی ڕژابێ (فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنْ الْخَاسِرِينَ) (المائدة- ٣٠)، جا چۆن دڵ لەت لەتو پارەپارە نەبێت کە برا برای دەکوژێ، کە هەردووکیانیش کوڕی حەزرەتی ئادەمن:

دڵ لەت دەبێ کە هەردوو جگەرگۆشەی ئادەمن
قابیلـە ئەشـقیایە (ابو الانبیاء) یە شـیث    ل ٩١

دونیا هیچە هەر هەمووشمان دەڵێین هیچە، بەڵام سەیر لەوەدایە کەسمان دەست لە ئارەزووەکانی هەڵناگرین هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت: (الدنیا جیفەو طالبها کلاب)، دونیا شتێکی بۆگەنە مرۆڤی عاقڵیش عەشقی شتی بۆگەن نابێت، تەنها سەگ نەبێت کە عەشقی شتی بۆگەنە:

دنیاکە هیچە، جوملە دەزانن کەچی چ کەس

مەردانە بۆ خودا نیە دەس هەڵگرێ لە هیچ ل ٩٨

یار بە لێوەکانی، لێوەلەرزەی بەو کەسانە خست، کە ئامۆژگاری خەڵك دەکەن کە هەرگیز بە شوێن پەیڕەوی دڵداران نەکەون، ئەگینا ئەو تەوبە نەصوحەی کردووە بۆت راناگیرێ، توبەی نەصوح واتە نەگەڕانەوە بۆسەر گوناە، یاخود چۆن شیر لە گوانی مانگا هاتەدەر جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ گوانی ئاواش مرۆڤ کە تەوبەی نەصوحی کرد نابێت بگەڕێتەوە سەر گوناە (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا) (التحریم- ٨)،

لێوی دەرخستو بە ناصح لێوەلەرزەی خست ئەگەر

بێ تەبەسسوم دەبێتە ئافەتی تەوبەی نەصوح ل ١٠٢

هەر کاتێك یار تەماشای مەحوی دەکا بەتیغی برۆی سینەی مەحوی شەق دەکا، بەو سنگ شەق کردنە مەحوی رزگاری دەبێتو دەحەسێتەوە، چونکە هەرچی پیسی هەیە دەری دەهێنێ، ئایەتی (الن نشرح) ئیشارەیە بۆ سنگ شەقکردنی پێغەمبەرﷺ: (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ، وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ) (الشرح: ٢-١)،

کە تیغت دڵ دەکا دوو قەد، دەدا تەبشیری (قد افلح)

دەنووسرێت لە صەفحەی سینە تەفسیری الم نشرح ل ١٠٣

بە خەندەی دەمی ئیشارە دەکا کە خەم مەخۆ سەرئەنجام هەر بۆ ئێمە چونکە خوامان لەگەڵە، بەتیغی برۆکانیشی هەرەشە دەکاو دەڵێ کەیف خۆش مەبن

سەرئەنجامی ئێوە هەر دۆراندن‌و پەشیمانیە وشەی (لاتحزن) ئیشارەیە بۆ ئـەو ئایەتـەی کە خوا دەفەرموێت دەربارەی پێغەمبـەر(ﷺ)و ئەبوبـەکری صـدیق کاتێـك کافرەکـان هاتنەسەر ئەشکەوت ئەبوبەکر ترسا لە دیتنیان (لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا) (التوبة- ٤٠)

بەخەندەی لەب دەداتن مژدە (لاتحزن) بە مەحزونان

دەمی تیغی برۆی ئیفشـــا دەکا تەهدیدی (لاتفرح) ل ١٠٤

دڵی مەحوی هێشتا هەر خەفەتبارە، جا خوای گەورە لەبەر خاتری حەزرەتی موسـا سلاوی خوای لێ بێ کاتێك دوعای کردو گوتی خوایە دڵو دەرونم ئاسودە بکەو ئـیش‌و کارو هەوڵو کۆششم بۆ ئاسان بکەو گرێی زمانم بکەرەوەو زمانم پـاراو بکـە (قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي، وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي، وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي) (طه: ٢٥-٢٧)،

دڵی مەحـــوی لە سینەی تەنگیـــا هەرما بەدڵ تەنگی

بە جاهی موسەوی بۆمەش وەکو بۆ ئەو بو (رب اشرح) ل ١٠٤

هەرکەسێك بیەوێت بگاتە لای خواو لیقای خوا بکات دەبێت کردەوەی چـاك ئـەنجام بدات‌و دەست لە دونیا هەڵگرێ، بەمەش دەبێت خۆی یـەکالا بکاتـەوە نەفـسی خـۆی بەڕەلا نەکات (فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا) (الکهف: ١١٠)،

چ خەیاڵێکە لیقا بێ بە فەنا بونی جەسەد

تا پریشان نشود کار بســـامان نرســـد ل ١١١

بەسیەتی مەحوی هێندە دەستەودامێنی ئەم‌وئەو دەبی بۆ ڕاپەڕاندنی کاری دونیـای خۆت، کە بەمەش خۆت تووشی هاوبەشی پەیداکردن دەکەی، پێویست بەوەناکات خۆت تەسلیمی خوای خۆت بکە پشتی خۆتی پێ‌ببەستە (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) (الاخلاص-١).

مەحویا با بەس بێ شیرکی تەشەببوث بەم‌و بەو

بگرە بەس دامەنی تەوحیـــدی (هو الله احـــد) ل ١١٤

لە شەوی ئیسراو میعـراج پێغەمبـەر(ﷺ) داوەت کـرا بـۆ ئاسمانـەکان، حـەزرەتی جوبرائیل یاوەری بوو، پێغەمبەر(ﷺ) سـواری گیانـدارێك بـوو پێـی دەگـوترا بـوراق، کەواتـە مـەحوی شـانازی بـەو پێغەمبـەرە(ﷺ) دەکـات کـە بـوراق لـە ژێریـەتیو جوبرائیلیش یاوەریەتی: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى) (الاسراء- ١)،

بنازم بەم شەهی مەه سەیرە بۆ گەشتو گوزاری ئەو
سـوارێکە: بوراقـی تەوسەنە جیـبریلیـە شـاتر          ل ١٢٦

مەحوی هەرکاتێك بەدیداری یارەکـەی دەگـا وەکـو تروسـکایی ئـاگر دڵـی ڕۆشـن دەکاتەوە، هەر کـاتێکیش لێـی دور دەکەوێتـەوە ڕەش هەڵدەگـەرێ، هـەروەکو چـۆن حەزرەتی موسا لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ میسر ئاگرێکی دیت، بـە خێزانەکـەی گـوت من ئاگرێك دەبینمو دەچم پشکو ئاگرێکتان بۆ دەهێنم بۆ ئەوەی گەرم ببنەوە (إِذْ قَالَ مُوسَى لأَهْلِهِ إِنِّي آنَسْتُ نَارًا سَآتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ آتِيكُمْ بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ) (النمل- ١٠)

ویصـالت نارە هیجـرت ڕۆژەڕەش، وەك ئافتابی تۆ
لە تۆ نەزدیکە پشکویە، خەلوزە گەر لە تۆبێ دوور          ل ١٢٩

مەحوی دەڵێت مرۆڤ نابێت لەخۆی ڕازی بێتو بڵێت من لە خەڵکی چاکترم ئەگینا بەدەردی شەیتان دەچێت، چونکە شەیتان خۆی بەزل زانی کاتێك داوای لێکـرا سـەجدە بۆ ئادەم ببات، بەڵام سەرپێچی ئەو فەرمانەی کردو گوتی: من لە ئادەم باشترم چونکە ئادەم لە قوڕ دروسـت کراوەو من لە ئاگر (قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ) (الاعراف- ١٢)

هەرکەس تەکەللومی بە (انا الخير)ـە وەك بلیس
ئەمڕۆ سـبەی خیطـابیـە (یا أیها البـزاز)          ل ١٣٥

ئاەو هەناسەی مرۆڤی ستەم لێکراو بە کەم مەزانە چونکە ئەو هەناسەی لە سینەی مرۆڤی ستەم لێکراو دێتە دەر عەرشی خوا دەلەرزێنێتەوە، یاخود هیچ پەردەیەك نیە لە نێوان دوعای مەظلوم بارەگای خوادا (عرش الرحمان يهتز لبكاء المظلومين):

با زۆری بێ، بەکەم مەگرە ئاهی بێ کەسان

بەم سروە بایە عەرشی خودا دێتە ئیهتیزاز ل ١٣٦

ڕۆژ تووشی دەردێکی بێدەرمان بووە، لە بەیانی تاکو ئێوارە هەرهاتووچۆیەتی ئوقرە ناگرێ، تاکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، ئەمەش هەمووی دەردی دڵداریە تووشی بووە، حەزرەتی عیسا کە مردووی زیندوو دەکردەوە، توانای نیە ڕاگرتنی ڕۆژی نیە (وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ) (ال عمران- ٤٩)

ئەم گـــلاراوەی لە عیشقە تا قیامەت هەردەبێ

صەد مەسیحا چاری ناکا، دەردی بێدەرمانە ڕۆژ ل ١٣٩

شەو ڕۆژی بێتاقەت کردووە، چونکە ئەوکاتەی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ ئاسمان شەو بوو، واتە ڕۆژ بۆیە هێندە بێتاقە چونکە پێشبرکێی بوو لەگەڵ شەودا بۆ ئەوەی لە ڕۆژدا بچێتە ئەو سەفەرە، بەڵام شەرەفی ئەم سەفەرەی پێغەمبەر(ﷺ) بەرشەو کەوت و ڕۆژ لێی بێبەش بوو (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى) (الاسراء- ١)،

شەو شەوی میعراجی شاهی ئەنبیا بێ، وادەبێ

بیپەرستی، بەڵکی سوجدەی بۆ ببا هەر ئانە ڕۆژ ل ١٤٠

شەومیعراج و ڕۆشتنی پێغەمبەر(ﷺ) بەر شەو کەوت، بۆیە هەتا دونیا ماٰیە ڕۆژ ئێرەیی بەشەو دەبات:

من بە فیدای ئەو زاتە بم، بەو، ئەو شەوە بوو بەم شەوە

تا قیامـەت هەر حەســـەد با بەو شکۆهو شـــانە ڕۆژ ل ١٤١

حەزرەتی عیسا وێڵو سەرگەردانە، دەگەڕێت بە ئاسماندا بە دوای پێغەمبـەردا(ﷺ) تاکو ئێستاش لە ئاسمانە(بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا) (النساء- ١٥٨)، پاشان حەزرەتی عیسا لە ئاسمان دێتە خوارەوە، کاتێکیش دەمرێت لەشاری مەدینە لە تەنیشت گۆڕی پێغەمبەرﷺ دەنێژرێت (ئێستا لە رەوضـەی پێغەمبـەردا ﷺ شـوێنێك هەیە بە بۆشی ماوەتەوە پاش مردنی حەزرەتی عیسا لەوێ دەنێژرێ):

ئەوی ئەو وێڵیە بورجی زەمینـــــــە

دەبەس بڕوا مەسیحا بۆ سەما، بەس ل ١٤٦

مەحوی گەیشتۆتە قەناعەت کە خەڵکی دەورووپشتی مرۆڤی نامەردن، بۆیە مەحوی دەستی لە هەموویان هـەڵگرتووە، رووی داوەتـە خواپەرسـتی، تـەنها پـشت بـە خـوا دەبەستم (فَإِنْ تَوَلَّـوْا فَقُـلْ حَـسْبِيَ اللَّـهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ عَلَيْـهِ تَوَكَّلْـتُ وَهُـوَ رَبُّ الْعَـرْشِ الْعَظِيمِ) (التوبة- ١٢٩)،

نائەهلیـــــی ئەم ئەهالییە مەعلومی من کە بو

شوکری خودا، خودا بەس، ئومێدم نەما بە کەس ل ١٤٧

هەناسەی یار وەکو ئەو هەناسەیەیە کە لە دەمـی عیـسا دەردەچـوو کاتێـك فـووی ئەکرد بەشت بەکاری خوا گیانی پیادەکرا، ئاواش ئەو هەناسەی سەرلێوەی یـار بـۆمن مایەی ژیانە (رَبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُمْ مِنْ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ) (ال عمران- ٤٩)

لە زولفیـــا ونە ڕۆ، لێوی هەر لە کارایە

ئەو ئافتابە گەر ئاوا بوە، مەسیحا خۆش ل ١٥٢

قەناعەت کەنزێکی نەبڕاوەیە، جا هەرکەسێك خاوەنی ئەو گەنجینەیـە بێـت دەبێتـە پاشا، جا ئەو خاوەنە قەناعەتە گەر گەداش بێت هەر پاشایە (القناعة کنز لایغنی):

گەدا شەه، چونکە (لایغنی)یە کەنزی

شـــەهەنشاهی هەموو دنیـــایە قانیع ل ١٦٧

مەحوی خۆشحاڵو سوپاس گوزارە کە لەوانەی عیشق رووزەردەو سەرفرازە، لێرەدا مەحوی ئەو رووزەردیەی خۆی بەو مانگایە دەچوێنێ، کاتێك بنو اسرائیل دەیانویست خۆیان لەو مەسەلەیە بدزنەوە کە داوایان لێکرابوو سەری ببڕن، مەحوی هەوڵی داوە زەردی ئەو مانگایە بە رووزەردی خۆی بچوێنێ (إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاءُ فَاقِعٌ لَوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ) (البقرة- ٦٩)، (بۆ زیاتر شارەزا بوون دەتوانرێت تەماشای تەفسیرەکان بکرێت):

شوکر ڕووزەردی عیشقم، نوسراوە

لەسەر ڕووم ئایەتی صَفْرَاءُ فَاقِعٌ ل ١٦٧

مەحوی وەکو مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ بڕوای بەوە هەیە کە ڕۆژێك دادێت حسابو کتاب دێتە گۆری، ئەو ڕۆژەش گەلێك تەنگە کەس بەهاواری کەسەوە نایەت (لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ) (عبس- ٣٧)، جا ئەو ڕۆژە تەنها شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە هانای ئەو خەڵکە دێت کە دەفەرموێت (انا لها) ئەمن بۆ ئەوکارە شیاوم لە شەفاعەت بکەم، دیارە (مەحوی)یش ئومێدی بەو شەفاعەتە هەیە:

لە ئیشی ئوممەتی بێ حەشرو نەشری

لە حەشردا هەر بەوە، بەو ڕەفعو ڕاجیع ل ١٦٩

پێغەمبەرﷺ کۆتایی پێغەمبەرانە (لا نبي من بعد) گەورەو سەروەری هەمووشیانە، ئیمامی بۆ هەموو پێغەمبەران کردووە لە شاری قودس کاتی چوونی بۆ قودسو پاشان بۆ ئاسمانەکان، کەواتە چۆن حەزرەتی موسا دەگاتە ئاستی پێغەمبەری ئێمە، هەروەها حەزرەتی عیسا کە سواری گوێ درێژ دەبوو چۆن دەگاتە پێغەمبەری ئێمە کە سواری بوراق بووە:

هەر شوانێ کەی دەبێتە هەم قەرینی شاهی من

سواری کەر نابێ ببێتە هەم تەکی سواری بوراق ل ١٧٩

ئیمامی عەلی (ﷺ) دونیای سێبەسێ تـەلاق داوە (انـی طلقتهـا ثلاثـە)، مـەحوی وەکو شوێن پێ هەڵگری ئیمامی عەلی دەڵێ ئەم دونیایە وەکو ئافرەتێکە هەر ڕۆژێـك لە باوەشی یەکێکە، دونیاش هەر ڕۆژەی بۆ یەکێکە بۆیە دەبێت تەلاقی بدەی دەسـتی خۆی لێ بکەیەوە.

تا لە ماڵی دەرنەکردووی ئەم شەوی صەد شووکەرە

(مەحوی) ئازانـــە بدە تۆ ســێبەسێ دنیا طــەلاق　　　ل ١٨٠

کاتێك زەمین لەرزە پەیدا دەبێت، زەوی هەرچی لەناویدا هەیە فڕێی ئەداتە دەرەوە، ڕۆژێکی زۆر بەسامە، کاتێکیش یـار پەچـەی لەسـەر ڕووی خـۆی لادەدا لایـەنگیرانو هەوادارانی هەرایـەکی ئـەوتۆ دەخـولقێنن وەکـو ڕۆژی حەشـری لێ دێـت (إِذَا زُلْزِلَـتْ الأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتْ الأَرْضُ أَثْقَالَهَا) (الزلزلة: ١-٢)،

لەپەردەی جیلوە یەکتا ڕوونمایە شۆری صەد مەحشەر

نیقـــــابی لادە لەو چیهرە، ببینە زەلزەلەی مەخلوق　　　ل ١٨١

بەهاتنی پێغەمبەر(ﷺ) کە دوا پێغەمبەر(ﷺ) هەموو ئاینەکانی تر بەتاڵ بونـەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانیتردا، هەرچـی پێغەمبـەرانی پـێش پێغەمبەرە(ﷺ) تەنها بۆ قەومەکانی خۆیان بوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕەحمەت بۆ هەموو دونیا ڕەوانـە کـراوە (وَمَـا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَـةً لِلْعَـالَمِينَ) (الانبیـاء- ١٠٧)، بۆیەش دەبێت وەکو پیتی الف بەژنوباڵای لەناو هەموو پیتەکانی تردا ڕێكوپێکترە:

باڵاتە وەك ئەلیـــف لە حروفاتی کائینـــات

مافەوقی تۆ کوژاوەیە ناوی لە تەحتو فەوق　　　ل ١٨٣

لەلای مەحوی گوتەی بێکردەوە هیچ سودێکی نیە، با مرۆڤ لە پێنج فەرزەی نوێـژ هەر بڵێ (ایاك نعبدو ایاك نـستعین) سـوودی چیـە، گـەر ئـەم گوتەیـە لـە کـردەوەی ڕۆژانەیدا ڕەنگ نەداتەوە (ئیمامی غەزالی) دەفەرموێت: (العلم بلا عمل جنونو العمل

بدون علم لا یکون)، احیاء علوم الدین، لێرەدا مەحوی مەبەستی سورەتی فاتیحە کـە موسڵمان لە پێنج فەرزەکانی نوێژدا دەڵێن (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) (الفاتحة- ٥)،

لە دڵدا خەلق‌و خوا بوو، فائیدەی چی

کــە دەم پڕ بێ لە (ایاك ...و ایاك)          ل ١٨٧

لەبەر گەورەیی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە ئاسمانەکانی دروست کردووە، کە لە حەدیـثێکی قودسیدا دەفەرموێت (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك) لێـرەدا مـەحوی ئەم فەرموودەیەی لە هۆنراوەکەی خۆیدا بەکارهێناوە:

خودا، تۆ لاگری لەولاکــە مەحوی

بە جاهی پادشاهی تەختی (لولاك)          ل ١٨٧

پیاوانی بە دیمەن خواپەرست، لە دونیادا هێندە چێشتی (نیسك) یان خواردووە، بۆیە لە دوارۆژدا لوتیان بۆنی میسك ناکات، جا ئەوانەی بۆنی میسك دەکەن دیارە ئـەهلی بەهەشتن، جا بۆیە دەبێت پێشبڕکێ‌کەران پێشبڕکێ بکەن بۆ ئەمەی بگەنـە بەهەشـت‌و بۆنی میسك بکەن (خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسْ الْمُتَنَافِسُونَ) (١٨٨)

مەئلوفە زەوقی زاهیــد ئەوەندە بەتامی نیسك

بێگانە ماوە شەممی لە نەشئەی خیتامی میسك          ل ١٨٨

ئەبوبەکری صدیق یەکەم خەلیفەی پێغەمبەرە(ﷺ) هەروەها هـاوڕێی پێغەمبـەر(ﷺ) بووە لە سەفەری بۆ شاری مەدینە، پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بۆتە جێنـشینی پێغەمبەر(ﷺ).

لەسەردەمی ئەودا کۆمـەڵێك کـەس لـە ئـایینی ئیـسلام هەڵگەڕانـەوە، ئەبوبـەکر هێرشی کردە سەریان دایمرکاندنەوە، هەروەها کۆکردنەوەی قورئـان لەسـەردەمی ئـەودا دەستی پێکرد، چونکە گەلێك لە یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە قورئانیان لەبەر بوو لـە شەڕدا شەهید دەبوون یاخود خۆیان دەمردن بۆیە لە ترسی فـەوتان قورئـانی هـەمووی

کۆکردەوە، سەرەڕای ئەم چاکانە هێشتا هەندێك کەس سفلەنەو قسەی ناشیرین دەرهەق ئەم ذاتە بەڕێزە دەکەن:

ئەو سەگانەن سپلە، سەبو ڕەفـضی ذاتی وا دەکەت

هیممەتی ئەو بەعدی ڕیحلەت نەبوەوە ئەم دینە حەك        ل ۱۹۵

هەروەها تەماشای لەخوا ترسانی عومەری کوڕی خەتاب بکـەن، کاتێـك نەیویـست گوڵە ناسکەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە حەزرەتی فاطمەیە بـژاکێ‌و تووشـی حـەرام ببێـت لەسەر باخی (فەدەك) ئەو باخە بوو نزیك خەیبەر کە بەر پێغەمبەر(ﷺ) کەوتبوو هەتا خۆی لە ژیاندا بوو بژێوی ماڵ‌و منداڵی پێ‌دەکرد، کاتێك کۆچی دوایی کـرد حـەزرەتی فاطمـە داوای ئەو میراتەی کرد لە ئەبوبەکری صدیق، ئەویش گـوتی پێغەمبـەری(ﷺ) باوکت دەفـەرموێت (نحـن معاشـر الانبیـاء لانـرث ولانـورث) واتـە: ئێمـە نـەمیرات وەردەگرین نە میرات دەدەین. جا لەم بەسـەرهاتە حـەزرەتی عومـەر(ﷺ) پـشتیوانی ئەبوبەکری گرت، مەبەستیشی ئەوەبوو کە نابێـت جـەرگی پێغەمبـەر(ﷺ) خـواردنی حەرام بخواو ئەم فەرموودەیەش ڕاستە:

وەرعی فاروقی تەماشاکەن، وتی: ناکا قوبوول

غیرەتم ژاکـــاوی ئەو گوڵباغە بۆ باغی فەدەك        ل ۱۹۵

هەرکاتێك مەحوی ڕووی یاری دەبینێ وەکو تیشکی ڕۆژ ئەدرەوشێتەوە، زۆر هـەوڵم دا شتێکی لێ فێر ببم، بەڵام بەداخەوە هیچی لێ حاڵی نەبووم، بەڵام ئەمـساڵ بەشـەو دێم، کاتێك یار رووی دائەپۆشی تاریـك دادێ وەکـو شـەوی لێ دێـت، ئـەم تاریکیـە موناسبە لەگەڵ بەخت ڕەشیم دەگونجێ (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا) (الشمس- ۱)، (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) (اللیل- ۱)،

بە دەرسی من نەشا (والشمس)ی پاری پاری طەلعەتت، ئەمسال

ئیجـازەم دە موتـــاڵاکردنی (و اللیل)ی خەطـــطو خـــاڵ        ل ۲۰۱

وەرزی بەهار وەرزی ڕازانەوەی دەرودەشتە، مرۆڤ خەریکی کەیفو سەفا دەبێت، جـا ئەوانەی لە کونجی مزگەوتدا وەرزەکانی تر خەریکی خواپەرستین لەم وەرزەدا هـەموویان دێنە دەرو شوشەی شەرەبیان لیٚ دەخەنە گەر. هەرکاتێك شەرابەکە لەناو پیاڵە دەکـەن قولقولی لێوەدێت (مەحوی لەم بەیتەدا ئاماژەی بە سورەتی ئیخلاص کردووە کە باسی تاكو تـەنیایی خوادەکـات): (قـل هـو الله احـد) (الإخـلاص-١)، کـە بەڵگەیـە بـۆ خواپەرستی.

دەبینـی (قل هو الله) خوێنەکانی کونجی مزگەوتـان
ڕوەو صەحرا، کە دەبیەن وا سوراحیی هاتەوە قولقول      ل ٢٠٥

مەحوی زۆر بێزارە لە کارگێڕی دەوڵەت، کۆمـەڵێك کـەس دەسـتیان بەسـەر دامـو دەزگای کۆمەڵ داگرتوە، لە ڕادەبەدەر خـراپن کـە وەکـو دەجالیـان لـیٚهاتووە، ئـەو دەجالەی کە مرۆڤ لەدین لادەدا جا بۆیە بۆ کۆتایی هاتنو رزگار بوون لـەم دەجالانـە پێویستیان بە عیسایەك هەیە بۆ ئـەوەی بیـانکوژیٚ، مـەحوی سـوودی لـەو کـەلتورە ئیسلامیە وەرگرتووە کە عیسا لە ئاخری زەمان دیٚتە خوارەوە دەجال دەکوژیٚ:

دەرچوو لە حەددی غایە عوروجی دەجاجیلە
یا ڕەببی تۆ بکەی کە بکا عیسـەیەك نزول      ل ٢٠٧

من هێندە کاری چاکەم کردو خۆم لەپێناو عەشقی تـۆدا کوشـت، چـونکە ئومێـدی زۆر بەوە هەیە، کە خوا دەفەرموێت: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه) (الزلزلة- ٧).

بەڵام تۆ بە پێچەوانەوە بە دەردی دووریت منت کوشت قەد ئەوەت بە خەیاڵدا نەهات کە خوا دەفەرموێت: (وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه) (الزلزلة- ٨).

حەیاتم صەرفی عیشقت کرد بە ئومێدی (فمن یعمل)
بە هیجرەت کوشتمو نەتکردەوە فکـری (ومن یعمل)      ل ٢٠٨

زولفی یار هێندە ڕەشە وەکو تاریکایی کوفر خستویەتیە گەردەنی مەحوی خەریکە دەیخنکێنێ، بەمەش بۆتە ئافەت بەلاّ بۆسەر دلّی هەموو موسلّمانێك، هەروەکو چۆن حکومەتی موسلّمان جزیەی ئەخستە سەر ئەهلی ذمە کە هەقی پاراستی ئەوان بوو ئەم جزیەیە:

بنازم من بە کوفری زولّفی تۆ ئەی ئافەتی ئیسلام
کە ئەستۆبەندی جیزیەی خستە مل ئیمانی خاص‌و عام ل ٢١٥

من بەرامبەر خوای گەورە گەلێك شەرمەزارم، چونکە ئەو وەکو منی ناشتوە بە سێو بۆ ئەوەی رووسوور بم، کەچی من بەهێی شەرمەزاری بۆ دەگرم، مەحوی لێرەدا بڕوای بەوە هەیە کە خوا جن‌و ئینسی بۆ پەرستنی خۆی دروست کردووە (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِي) (الذاريات- ٥٦)

لە رووسوریی عیبادەت لام و رووزەردی خەجالّەت مام
بەناوی سێوی ناوم باغەوان و، من بەهێ دەگرم ل ٢١٨

کاتێك رۆژی قیامەت دێت‌و هەرکەسێك بەرەو مەیدانی لێ پرسینەوە دەکەوتەرێ، خەلّکی پۆل پۆل رادەوەستن بۆ لێپرسینەوە، جا ئەوانەی لە دونیا یەکتریان خۆشویستوە لەگەلّ یەك دەبن جا لە هەر چ گروپ‌و تاقمێك بن (يحشر المرء مع من احبه) یاخود (المرء على دين خليله) جا مەحوی دەلّێ گەلی دۆست‌و برادەران خۆتان لەمن بپارێزن با حەشرتان لەگەلّ حەشری من نەبێت‌و بە ئاگری من نەسوتێن:

سبەینێ (يحشر المرء)ـە براگەل، فرسەتە ئەمڕۆ
تەبەڕڕا بن لەمن باکەس نەبێ حەشری لەگەلّ حەشرم ل ٢٢١

من وەکو تەیری قەقنەس لێت دور کەوتووەتەوە، چونکە قەقنەس هێندە بەرز دەبێتەوە تاکو لە ڕۆژ نزیك دەبێتەوە هەتا خۆی دەسوتێنێ، منیش لەتاو دوریت ئاگرێکی ئەوتۆ لە گیانمایە وەکو ئاگری دۆزەخە (يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ) (القمر- ٤٨)

به ئۆغرکردنی من بومە قەقنەس

که ئەو چوو بۆ سەفەر، من بۆ سەقەر چوم ل ٢٢٦

مەحوی بۆتە نێچیری نەفسی خۆی، بەدوای ڕێگاچارەیەك دەگەڕێ بۆ ئەوەی رزگاری بێ لەدەستی، دیارە پەناشی بۆ خوا بردووەبەڵکو بە هانایەوە بێت.

لەسەر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئان نەفس بە سیفەتی (امارة) وەکو (إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ) (یوسف- ٤)، جارجاریش بە سیفەتی (لوامە) وەکو (لاَ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَلاَ أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ) (قیامە ٢)، جارجاریش بە (مطمئنە) ناو دەبرێ (يَاأَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ) (الفجر ٢٧)، ئەم سێ نەفسە هەر ئەو نەفسەن لەگەڵ روحدا یەکێکن، بەڵام لە گیانی خۆیدا بە تەبیعەت (ئەمارەیە)و فەرمان دەدا بە بەجێهێنانی ئارەزووی خۆی، وە لەپاش ئەوە کە بەندەیی طاعەت مەشغول کرا وای لێدێ لە نێوان ئەحواڵی موختەلیفە دەمێنێتەوە لە رووی زۆرهێنانی هێزی ئارەزووی بەدەوە ئارەزووی بەهێز دەبی کاروباری ناباری دێ بەسەرداو تاوان دەکالەبەر هێرش هێزی (اطمئان) روو دەکاتەوە بۆلای هەق‌و عیبادەت‌و سەرزەنشتی خۆی دەکا لەسەر گوناه لەوکاتەدا ناو دەبرێ بە (لوامە) وە ئەگەر تەوفیقی بێ خودا لەم حاڵە پەستە رزگاری ببێ‌و شیفای بۆ بێت دادەمەزرێ ناو ئەبرێ بە نەفسی (مطمئنە):

ئەسیرو صەیدی قەیدی کەیدو شەیدی نەفس ئەمارەم

لەدەست ئەم مارە بەدچارە چیە چارم، خودا چارەم ل ٢٢٨

لە ڕۆژی حەشردا هەرکەس دەفتەری کـردەوەی دەدرێـنـێ دەڵـێ کردەوەکـانی خـۆت بخوێنەوەو بزانە لە دونیا چت کردووە (اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا) (الاسراء- ١٤)، مەحوی لەو ڕۆژەدا سینەی خۆی دەکاتەوە کە قورئـانی تیایـە دەڵـێ ئەوە کردەوەی منە:

بە ناخـــوون صورەتی یارم لە صەفحەی سینە نوسیوە

لە حەشردا وەقتی نەشری نامە کردن، منمو سیپارەم ل ٢٢٩

مەحوی وەکو هەرکەسێکی تر پیر بووە لەگەڵ ئەم پیریەش دوو سیفەتی لەگەڵدا چرۆ دەکەن وەکو نەمام سەردەکەنو بالا دەکەن ئەویش تـەماعو تەمـەن درێـژی هـەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (یشیب ابن ادمو یشب فیه خصلتان: الحرصو طول الامل)

پیری نەمامی باغی جوانیمی کردە پووش

تازەم درەختی طـولی ئەمەل دەردەکا چرۆ ل ٢٥٤

مرۆڤ لە خاك بوەو دەبێتـەوە خـاك، کەواتـە هـەتا زووە بـڕۆ خـۆت لەبـەردەرگای (ابوتراب) کە کونیەی حەزرەتی (عەلی)یە (ﷺ) وەربـدە هـەتا نەبویـەوە خـاك وەکـو دەفەرموێت (کلکم من ادمو ادم من تراب)

لە دایەی خاکت ئاخر هەر دەبێ بگریتە باوەش خۆی

بکە خاکێ بەسـەر خۆتا لە قاپیی (بو تراب)ێ زوو ل ٢٥٦

شەو زۆر بە پیتو بەفەڕە، خوای گەورە گەلێك گەورەی کردووە، چونکە لـە شـەودا پێغەمبەر(ﷺ) چوە ئیسراو میعـراج (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى) (الاسـراء- ١)، هەروەها هەر لە شەودایە کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە دە شەوی ئاخیری مـانگی ڕەمـەزان دابـەزیوە (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ) (القدر- ١)، دیسان دابەشکردنی ڕزق لە نیوەی مانگی شەعبان بووە، کە واتە

ئەو شەرەف‌و گەورەییە بەرشەو کەوتووە.

هێندە صاحێب سیرە (میعراج)و شەوی(قەدر)و (بەرات)

خاصـــەجاتی ئەون و، مومتازە بەم ئەســـرارانە شــــەو ل ٢٥٩

پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی ٩ی کۆچی نامەی بۆ پاشاکانی دەوروپشتی خۆی نارد، کـە بێنە سەر ڕێگای ڕاست کە ئـاینی ئیـسلامە وەکـو پاشـای حەبەشـی هەرقـەلی ڕۆم‌و خوسرەوی پەرویز، بەڵام نوسرەوی پەرویز بێ‌ئەدەبی کرد بەرامبەر پێغەمبـەر(ﷺ) کـە نامەکەی دڕاند، پێغەمبەر کە ئەم هەواڵەی زانی فەرمووی: (اللهم مـزق ملکـە، کمـا مزق کتابی) کەواتە وەکو مەحوی دەڵێ ئەدەب زۆر باشە بۆ مرۆڤ هـەروەکو دوعـای چاوزار وایە خەڵکی دەپارێزێ:

خودا بیــدا ئەدەب (حرز الامان)ێکە عەطییەی ڕەب

چبوو جەرگی بری غەیری ئەمەی نامەی دڕی خوسرەو ل ٢٦٢

شاعیر سەری لەوە سورماوە کە مرۆڤی عـاقڵ دونیا دیدە گوێ بە دونیا ناداو حـەلاڵ حەرام لێك جیاناکاتەوەو لە خوا ناترسێ، بـەڵکو بـە پێـچەوانەوە مرۆڤـی لـەخواترس دەبێت کردەوەی چاکە بکات، چونکە هەموو کردەوەیـەکی چـاکە لـە ترسـی خواوەیـە هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویت (راس الحکمة مخافة الله):

عەجیبم دێ لەعەقڵی ئەو کەسە واتێ دەگا مەردە

کەچی وەك خان‌و خانم دائیما دڵخـۆش‌و بێ دەردە ل ٢٧٠

هەرکاتێك یاری سەوزی کەواشین دێت تەماشای خەستەخانەی عیشق دەکا، مرۆڤـی خەستە دەکەوێتە حاڵی حەلوەلا دەکەوێتە گیاندان ئەوکاتە خەڵکی لەسـەری سـورەتی (یاسین)ی لەسەر دەخوێنن (یس والقرآن الحکیم) (یـس- ١)، یـاخود یەکـسەر گیـانی دەردەچێت، بەمەش دەبێتە شین‌و گریان لەسەر ئەو نەخۆشە کە گیانی دا:

لە سەیری خەستەخانەی عیشق ئەوی سەوزەی کەوا شینە

لەسەر هەر خەستە دێ یا خوێندنی یاسـینە، یا شـینە ل ٢٨٣

پیری تەریقەت دەزانێت هەرکاتێك بگرێت ئەوا یەکسەر ڕەحمی خوا دەگاتـە فریـای، بۆیە پیری تەریقەت بە ریشی (سپی)یەوە فرمێسك بەسەر ریشدا دێتە خوارەوە، وەکـو منداڵ (فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا) (التوبة- ٨٢).

لەگەڵ فەریادو گریە حاضرە فەریادڕەس (مەحوی)

لیبکـــوا ڕێ دەدا پیری طەریقەت طیفلی ساوا بێ ل ٢٩٦

هەڵگرتنی ئەو پەیمانە گـەلێك زەحمەتـە کـە ئـەو دڵـەی مـن بـاری عـشقی یـاری هەڵگرتوە، کەچی ئەم گەورەییە بە زەوی‌و ئاسمـان‌و چـیاکان هـەڵناگیرێ (إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولا) (الاحزاب- ٧٢):

خودا گرتوو دڵم، چۆنن بەگژ شۆرو شەری عیشـــقا

بە نەصصی ئایە ئەفلاك‌و زەمین ئەم بارە ناکێشێ ل ٣٠٣

دونیا تەمـەنێکی گەورەی هەیە وەکو دەڵێن (پـیرە دونیـا) جـا ئـەم دونیـا گـەلێك مرۆڤـی پێگەیانـدوەو، پاشـان لـەناوی بـردوون (یـەکێك) لـەو مرۆڤـە بەدەسـەڵاتانە (ذوالقرنین) کە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای لە ژێر دەستدا بوو، کەچی کە لێ کەوت دنیـا بـە گاڵتەوە گوتی کوا ئەو دەوڵـەت‌و دەسـەڵاتەی هـەتبوو، ذوالقـرنین نـاوی لـە قورئانـدا هاتووە کە خوا دەفـەرموێت: (قَالُوا يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ) (الكهف- ٩٤).

هەروەها دەگێڕنەوە حەجاجی کوڕی یوسفی ثەقەفی کاتێك لە سەرەمەرگ بـوو ئـەم ئایەتەی دەخوێندەوە (مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِي، هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِي) (الحاقة: ٢٨-٢٩)،

دنیا بە نەوسەوە دەمی مەرگی وتی کە (ذول

قرنین)ی دی زەلیـــلە لەکن خۆت ئەتۆ کەڵی ل ٣٠٨

مەحوی دەڵێ من وەکو مێرولە وام با واعیظ هێندە لەپاشملە باسم نەکات، گەرچی

من وەکو مێرولە وام بچوکم بەڵام زەبری کاریگەریشم هەیە گەر هێندە باسم بکات وەکو ئەو کەسەیە کە مێرولە بخوا بای لێ بەردەبێ جگە لەوەش غەیبەت کردن وەکو ئەوەیە گۆشتی مردووی برای خۆت بخۆی: (وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا) (الحجرات- ١٢)

به غەیبەت کردنی ئەم بێنەوایە توشی خەجلەت دێ

بلێ واعیظ بەس ئەم مێروولە بخوا وازی لێ بێنێ ل ٣١١

هەر کەسێك لە قورئان وردبێتەوە لە نهێنیەکانی قورئان حالی ببێ زۆر بە ئاسانی بۆی دەردەکەوێت کە بەهەشتو دۆزەخ وەکو یەك نین (لاَ يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ الْفَائِزُونَ) (الحشر- ٢٠)

تێدەگا هەرکەس بکا فەهمی ڕووموزی مەعنەوی

هیجرو وەصڵە نارو جەننەی ئایەتی (لا یستوی) ل ٣١٦

من نازانم بە تیری کێ پێکاوم، هەرقسەیەکیش بکەم دەبێتە بوختان چونکە من دڵنیا نیم، تەنها ئەوەندە نەبێت کە بڵێم خەبەری ڕاست لەلای جوهەینەوەیە.

لە کەلتوری ئیسلامەوە هەیە (جوهەینە) کۆتایی کەسە کە لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێت (لە ئیماندارەکان) بۆیە ئەو کۆتا هەواڵی لەلایەو ئەو هەمووکەسێك باشتر دەزانێت.

دڵ شەکەتی تیری کێم؟ چاوی بزانێ مەگەر

توهمەتە هەرکەس بڵێم (عند جهینه الخبر) ل ٣٣٨

هەرکاتێك یار ڕاست دەبێتەوە، ڕۆژی قیامەت دێت، بە بەڵگەی ئەوەی من لە کۆڕی مەی خواردنەوە دانەنیشاوم ئەی بۆ سەرخۆش بویمە. کاتێك ڕۆژی قیامەت دێت خەڵکی وەکو سەرخۆش وان کەچی سەرخۆشیش نین، بەڵام لەبەر سەختی ئەو ڕۆژەیە (وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ) (الحج- ٢)

هەستانت ئەو قیامی قیامەت نیە، چیە

بێدەخلی چەنگو نەیو مەی لەمەست ئەچم ل ٣٤٢

مەحوی دەمێکە گفتوگۆ دەکا، بەڵام بێسوودە چونکە ئەو گفتوگۆیەی کە دەیکات هیچی لێ حاڵی نابێت، ئەوەی دەیلێش زۆر دوورە لە ڕاستیەوە چونکە مەحوی زانستێکی کەمی هەیە، ئەویش کە هەیە خوا پێیداوە: (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً) (الاسراء- ٨٥).

هەر گفتوگۆمە، کەچی هەر دەڵێم وتێ ناگەم

هەر چوستو جۆمە، کەچی هەر دەڕۆمو پێناگەم

چاو ڕواوو گوشەیی ئەو ئەبروەم نەدی

دڵ بۆ بە بەحری عولوومو لە ئەلفو بێ ناگەم ل ٣٤٣

لەسەردەمی عەباسیەکان زۆر ئازارو ئەشکەنجەی ئیمامی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) یان دا بۆ ئەوەی فەتوای ئەوەی پێبدەن کە قورئان خالقەو پەیدا بووە، بەڵام ئیمام ئەحمەد ڕەزای خوای لێ بێت ئەم ناهەقیەی نەسەلماندو بەڵکو سوڕ بوو لەسەر ئەوە کە قورئان خالق نیەو شتێکی ئەزەلیە:

حادیث نیە، قەدیمە، کەلامی خودا بەهەق

دەم بۆ حەدەث بە ناهەق ئەبەن (ضال)و گومڕەهان ل٣٧٥

خوای گەورە لە ماوەی شەش ڕۆژدا ئەرزو ئاسمانی دروست کردووە، گەراوەتەوەش سەر عەرشی خۆی (ئێمەش نازانین هەر ڕۆژەی درێژی چەندە، هەروەها (عەرش) یش هیچ زانیاریەکیان نیە)، بەڵام ئیمامی مالیك دەفەرموێت (استوی معلومو کیفیە مجهولو السؤال بدعەو الایمان بە واجب: (وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیارکردنی بیدعەیە، باوەڕبوون پێی واجبە). (خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) (السجدة- ٤):

باوەڕ ببێ خودا کە لەسەر عەرشە موستەوی

ئەمما بە ئیستیوایەکی بێ چوونو کەس نەزان ل ٣٧٥

تۆ هەردەم ناوی ئەو خوایە ببە ذکری (الله اکبر) بکە، کە ئەو خوایە هیچ منداڵی نیەو شەریكو هاوتای بۆخۆی دانەناوە (وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنْ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا) (الاسراء- ١١١)، هەروەها لە سورەتی ئیخلاصیش دەفەرموێت: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، اللَّهُ الصَّمَدُ)(الإخلاص: ١-٢).

نەیگرتوە شەریكو موعینو ژنو وەلەد
بۆ ئێمەیە لە ئایەتی (عز) ئەم قسە عەیان ل ٣٧٧

پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر زەوی ناوی (موحەممەد)ـە، لە ئاسمانیش ناوی (ئەحمەد)ە، حەزرەتی عیسا مزگێنی دەدا بە خەڵکی خۆی کە پاش من پێغەمبەرێکی تر دێت بەناوی ئەحمەد، پەیڕەوی ئەو بکەن (وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ) (الصف- ٦).

یەعنی پەیەمبەری عەربی، هاشمی نەسەب
ئەحمەد لە ئاسمانو موحەممەد لە سەرزەمین ل ٣٧٩

## سەرچاوەکان


١- لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی دیوانی مەحوی (مەلا عبدالکریمی مدرس، فاتح عبدالکریم)، هەروەها ڤیستیڤاڵی مەحوی لە هەولێر، نوسینی نامەی دکتورای وەکو د.بدیعە مەحوی، د. ئیبراهیم شوان، د. احمدی مەلا..

٢- لەبارەی مەحوی لوتکەوە / پێشەکی رونکردنەوەو ئامادەکردنی عبدوڵلا خالید ئاگرین، چاپی یەکەم ١٩٨٦، ئەمینداریەتی گشتی روشنبیریو لاوانی ل ٨٩.

٣- تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز، دانانی مەلاعبدالکریمی مدرس / بەرگی ٥ لە ل ٣٣١

٤- هەمان سەرچاوە / ل ٥٢

٥- تەفسیری نامی مەل اعبدالکریمی مدرس / بەرگی حەوتەم / ل ١٧ .

تێبینی:- هۆنراوەکان لە دیوانی مەحوی، لێکولینەوەو لێکدانەوەی، مـەلا عبـدالکریمی مـدرس و فاتح عبدالکریم، چاپی دووەم، ١٩٨٦، چاپخانەی ئوفیسی حسام.

تەماشای تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، دانانی (برهان محمد امین) کراوە.

# شـێخ ڕەزای تـاڵـــەبانی

شێخ ڕەزای تاڵەبانی ١٨٣٧ لە گوندی (قـرخ)ی نزیـك چەمـچەماڵ لـە دایكبـووە، شاعیر ناوی خۆی وەك نازناو بەكارهێناوە، هەندێك جاریش (لامیع)ی بەكارهێناوە.

جومعانە بڕاوە بەخودا موفلیسە (لامع)

نە پوولی حەمامی هەیە نە پارەیی تووتن

شێخ رەزا لە بنەماڵەی شێخانی تاڵەبانین، سـەر بـە تەریقـەی قـادری. شـێخ وەكـو سەردەمەكەی خۆی چۆتە حـوجرەی مزگەوتـەكانو فێـری خوێنـدنو نووسـینی بـووە، سەرەتا لەلای باوكی دەستی بە خوێندن كردووە پاشان ناوچەكانی كوردسـتان گـەڕاوە، ماوەیەكیش لەشاری كۆیە لەلای مەلای ئەسعەی جەلی زادە خوێندویـەتی، شـێخ ڕەزا هێشتا باوكی لە ژیاندا بووە سەفەری بۆ ئەستەمبول كردووە، لەم شارەدا گـەلێك شـت فێربووەو چاوی كراوەتەوە، لە ڕێگای هاتنەوەیدا هەواڵی كۆچی دوایی باوكی دەزانێت.

شێخ ڕەزای شـاعیر هـەتا بـاوكی لـە ژیانـدا بـووە، ژیـانێكی سـادەو زاهیدانـەی رابواردووە، بەڵام پاش كۆچی دوایی باوكی دەیەوێت لە ژیـانی تەسـكی دەروێـشایەتی بچێتە دەرەوە، بۆیە لەگەڵ شـێخ عـەلی بـرای دانویـان بەیەكـەوە ناكولێـت، زۆربـەی كێشەكانیشیان لەسەر موڵكو ماڵی باوكیان بـووە بۆیـە لـە ڕقـی براگـەورەی شـاری كەركوك بەجێدەهێڵێ:

بەم حاڵە ئەگەر دەفعەیێ تر بچمەوە كەركوك

مەعلـوومە بە مەردی نەڕواوە لەسەرم تووك    شێخ ڕەزا

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە خوای گەورە بە قودرەتی خۆی ئەوانەی دەرکردووە وەکو مێروولەی ورد زۆر وردی وەکو عەرەق لە لەشی مرۆڤ دەربێ بە وشەی (بلی) وەلامی خوایان داوەتەوە، هەروەها خوای گەورە ئەم پەیمانەی لە شوێنێك کە (بطن نعمان) لە نزیك خاکی عەرەفاتدا وەرگرت لەسەر قسەی (ئیبن عەباس)، هەندێکیش دەڵێن لە خاکی (سەرانديب) لە شوێنی تریش هاتووە لە قورئاندا (لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى) (الزمر- ٧١)، (قَالُوا أَوَ لَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى)(غافر- ٥٠)، (أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ٨ قَالُوا) (تبارك: ٨-٩).

وەفایی هێندە عاشقی ڕێبازی سۆفیگەری پیرەکەی خۆی بووە کە شێخ عوبیدوڵلایە دەڵێ وەرە ئەم جارەش هەروەکو جاری پێشوو کە هەموو پەیمانی (الست)دا ئەمجارەش عەهد بکە جامی خۆشەویستی بەدەستەوە بگرە، بۆ ئەوەی هەتا ئەبەد مەستو سەرخۆشی ئەو خۆشەویستیە بن، چونکە ئەوە ڕێگای خۆشەویستانە:

دیسان لەسەر عەهدی (الست)

جامێك لە جامان بگرە دەست

هەتا ئەبەد مەخمورو مەست

هەذا طريق العاشقين ل ١٠٠

لە دیوانی وەفایی چاپخانەی کوردستانی هەولێر، کۆکردنەوەو بلاوکردنەوەی گیوی موکریانی (هذا طريق العاشقين) کراوە بە (ئەوەیە ڕێگای عاشقان) هەندێك لە گۆرانیبێژانیش ئەم هەلەیان قۆستۆتەوە کردویانە بە گۆرانی، لایان وایە کە ڕێگای عاشقان ئەوەیە کچێكو کوڕێك یەکتریان خۆش بووێو ئەمە عاشقانیە، بەلام لای وەفایی ئەم عەشقە جۆرێکی ترە عەشقێکی حەقیقیە بۆ خۆشەویستەکەی.

لە شوێنێکی تردا کە بۆ عەشقی حەقیقی گوتویەتی منی شێتو شەیدا کرد، ئەو کاتەی بە جامێکی خۆشەوێستی عەهدی (الست)و بەدەستی خۆی هات پڕ بەدڵی

شکستەی خۆی جامی خۆشەویستی خۆی دامێ کە ئەمەش عەهدو پەیمانە وەکو ڕۆژی (الست):

گوتم: ئەی شوخی چاوبەستم، خەرابو عاشق ومەستم

بێننەوە، کاتێك دێت پێی بڵێ کوا ئەو سۆزو خۆشەویستیەی بۆ وڵاتەکەی خۆت هەتبوو؟ هەروەها کوانێ ئەو عەهدو پەیمانەی ڕۆژی (الست) دات:

دڵە سەرەتاش هەر سەفەری بویت تۆ هەر خۆت دەبەست
تاکـــەی غەریبو ئاوارەو ســـەرمەســـــــــت
کە (وەفایی)ت دی لەجێی من بلـــــــــــێ
کوانێ ئەڤینی وڵاتو کوانێ پەیمانـــــــی (الست)

هیچ شتێك لەخۆڕایی ئاگر ناگرێتو ناسوتێت، تۆش بە خۆڕایی نەسوتاوی بەڵکو بە ڕووتەوە دیارە کە بەعەشقی خۆشەویستیەوە سووتاوی، بەڵگەش بە ئاشکرا بەڕووتـەوە دیارە هەروەکو چۆن نوری خوای گەورە لە کێوی سینادا کردیـە وردە خۆڵـەمێش، ئـەم سووتانەش ئاوا لە سینەیدا دیارە: (رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنْ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا) (الاعراف- ١٤٣)،

بە خۆڕایی نیە سووتاوی ڕوتە عاشقی شـــەیدا
لە ڕوتی دیوە جیلوەی ئاتەش (سینا) لە سینەدا ل ١٢

دیسان دەربارەی کێوی سینا دەڵێت بەهۆی جوانی تۆ لە سینەمدا وەك عەکسی ڕۆژ ڕەنگ دەداتەوە، ئێستاش مەستو سەرخۆشی تەجەلای کێوی سینام بێهۆش بوو.

خۆشا بەو ڕۆژە عەکسی پرتەوی حوسنت لە سینەمـــدا
ئەوێستاش مەستو مەخموری تەجەلای طووری سیناکەم ل ٧٥

دەردی عەشق دەردێکی بێدەرمانە، منیش بە دوای ئەم عەشقەوە وێڵو سەرگەردان بووە، کاتێکیش لێی نزیك دەبمەوە بە وەڵامی (لن ترانی) ئاگرم تێبەردەبێو دەسوتێم (لن ترانی) ئاماژەیە بۆ وەلامی موسا پێغەمبەر سلاوی خوای لێ بێت، کاتێك داوای بینینی خوای گەورەی کرد، خواش بە (لن ترانی) وەلامی دایەوە ناتوانی مـن ببینـی بەڵام تەماشای کێوی طور بکە

لە دەردی بێ دەرمانی کەوتومە سەرگەردانـــی
بەرەحمەت بگرە ها دەستم، خوماری ئاشکرا کـــرد
دڵی دا دڵ شکستی خۆی، هەڵستا هات بەدەستی خۆی
بە جامێکی (الست)ی خۆی، (وەفایی) شێتو شەیدا کرد ل ٣٦

ئەو چاوەی کە هەردەم مەستو سەرخۆشە، بەبادەی ڕۆژی (الست) کە ڕۆژی عەهد کردنە، جا وەرە لەسەر ئەم عەهدە دەستم بگرەو رزگارم بکە، سوێند بەو دینو ئاینەی کە تۆ لەسەری:

چاو بازەی چاو مەستە، لەو بادەی ئەلەستە
دەستم بگرە هەستە، تۆو دینو ئاییـــنت ل ٣١

بە دلۆپێك بادەی ئەو عەشقەی کە لە ڕۆژی (الست) عەهددا، منیش بەو بادەیە مەستم، ئەگەر بە دلۆپێکیش بێت نەجاتم بدە لەو دەریا بادەیە کە هەقە ئەوە من هەر ڕووی تێدەکەم:

بەسەر مەستانی بادەی ساغیری عەهدی ئەلەستت کەی
بە قەطرێکی نەجاتم دەی لەدەست خۆم روو لە دەریاکەم ل ٨٠

لەوڕۆژەی کە عەهدی (الست) وەعددا، ئێستا هەستە وەرە بەجامێکی دەست لەم بادەیە بدە دەستم، چونکە ئەم ڕێگایە بەستەدەری گوڵزارە بۆ ئەوەی مەستو خامۆش بێ، هەرچەندەی لەم هاتو چووە بێمو بچم بە دەوری پەروانەدا بسوتێمو گوناهی تۆی تیابێ، بەڵام بە شەرعی شەم هەر گوناهی منە، چونکە کە شەم ئەتوێتەوە، پەروانە بە

دەوری ئاگرەکەی شەمدا ئەسوڕێتەوەو خۆی لە ئاگرەکە ئەداو ئەسووتێ:

هەستە وەرە بەو جامەی ئەلەستی بدە دەســـــتم
بەستەی دەری گوڵزارە ئەوی مەستی صەفات بێ
صەدجار بچمو بێمو بسوتێم حەقی تۆیــــــــــە
هەرچەندە بە شەرعی شەمو پەروانە خەطات بێ ل ١٧٧

وەفایی سەرزەنشتی دڵی دەکاو دەڵێت لەو ڕۆژەی کە هەی هەر سەفەری بویت، هەر خۆت ئامادە دەکرد بۆ ڕۆیشتن،

تاکەی بە غەریبیو مەســــــــــــــــــــــتی
بە جوابی (لن ترانی) چ بکەم رووحم ســــوتاوە ل ١٥٣

هەروەها جێگای قسەکردنی موسا پێغەمبەر، لە کێوی طور وەڵام درایەوە بـە (لـن ترانی) دەڵێ عاشق قوربانی طوری سینا بێت کە شوێنێکی پیرۆزە.

لە جێگای تەجەللی دەم بە دەم بێ (لن ترانی) بێ
بە قوربانی دڵی عاشق هەزار وەك طوری سینا بێ

هەرچەندە شتێك تۆ پێت خۆشە مایەی ڕەحمەتو مەقصودی دڵێ منە گەر بە شێوەی عیتاب وەڵام بدەیتەوە کە (لن ترانی)یە، یاخود بە شێوەی خیتاب پێم بڵێ (او دنا)

هەرچی تۆ پێت خۆشە مەحضی رەحمەتو مەقصودی دڵمە
گـەر عیتابی (لن ترانی) یا خیطـابی (او دنا) بـــــێ ل ١٧١

ڕۆژێك پیری مەیکەدە پێی گوتم دڵت بەملاو بەولا نەڕوات بەهیچ شتێکی تر خـۆت خەریك مەکە، چونکە دڵی مرۆڤ جێگاو شـوێنی خراپـە (إِنَّ الـنَّفْسَ لَأَمَّـارَةٌ بِالـسُّوءِ) (یوسف)، پیری مەیکەدە لەلای ئەهلی تەسەوف بۆتە ڕەمزی پیری تەریقەت، هەر ئـەو پیرە ئامۆژگاری وەفایی کردووە کە دڵی خۆی بە هیچ نەدات:

ڕۆژێکی پیری مەیکەدە فەرمووی دڵت بە هیچ مەدە
ئەو دڵە مەقسەدە عەکسێکی رووی دلـــداری گرت ل ٢٦

مرۆڤی لەخوا ترس نابێت لە خوای خۆی غافڵ بێت هەرکاتێك لە خوا غافـل بـووی شتی دنیات دەکەوێتە دڵەوە، دیارە دڵی پڕ لـە بـاوەڕیش دڵێکـی تـەواوە بـێ کـەمو کوڕی، کاتێکیش غافـل بـووی شـتی تـر دەکەوێتـە بەرچـاوی ئـەم دڵـەش بەڵگـەی نەخۆشیە، جا بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیە، سۆفیەکان ساڵی جارێك چـلە دەکێـشن بۆ تیمارکردنی ئەم نەخۆشیە:

غافل بووم جارێك لەناکاو، ڕەنگی غەیرێکم کەوتە چـاو

قەلبی سەلیمی ناتەواو (نەخۆش بووم لێم) ئـازاری گرت

کاری دڵم چل ڕۆژە بوو نەك بێکاریو دەرویــــــزە بوو

مەقصودی من (پیرۆزە) بوو ئەو رۆیی بۆ ئیمـاری گرت ل ٢٦

نەهری دورخرایەوە بۆ حیجاز لـە شـاری طـائـف نیـشتەجێ بـوو، پاشـان بـەنیازی سەفەری حەج دەچێتە شاری مەککەی پیرۆز لـە (٩)ی ذوالحجـە سـاڵی ١٣٠٠ کۆچـی بەرامبەر بە (١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨٣ ی زاینی کۆچی دوایی کرد لەنزیك ئامینەخانی دایکی پێغەمبـەر(ﷺ) بـەخاك دەسـپێردرێت، کاتێـك حاجیـانی شـاری سابلاغ دەگەڕێنەوە هەواڵی کۆچی دوایی شێخ بلاودەکەنەوە[٨]، وەفایی بەم هەواڵە زۆر نارەحەت دەبێت قەصیدەیەکی ماتەمینی دەنوسێتو دەڵـێ ئـەو کەسـەی نیـشتەجێ بێت لەبەر دەرگای تۆ بەهەشت جێگایەتی، ئەی شێخی نەهری تـۆش خـاوەنی لوتـفو کەرەمی، هیچ لە لوتفت کەم نابێ گەر منیش لە ڕیزی سـەگەکانی بـەردەرگات قبـوڵ بکەی، بەڵکو خوا بکات بچمە بەهەشت.

لێرەدا ئەو عەشقە پاکەی وەفایی بە دیار دەکەوێت کە وەفایی چەند دڵسۆزی بیرو باوەرەکەی بووە وە عـەقیدەیەکی تەواوی هەبووە بە بەهەشت:

موقیمی خاکی دەرگای تۆ حەریمی جەننەتە جێگـای

لە لوطفی تۆ چ کەم نابێ منیش لە ڕیزی سەگانت بم

ئیبراهیم پێغەمبەر سلاوی خوای لێبێت یەکێکە لە پێغەمبەرەکانی هەروەها باوکی پێغەمبەرانیشە بۆیە هەریەك مەسیحیەکانو جوولەکەکان دەڵێن ئیبراهیم پێغەمبەر لە ئێمەیە بەڵام خوای گەورە وەلامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: (مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِنْ كَانَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ) (ال عمران- ٦٧).

وەفایی ڕوو لە عاشقەکەی دەکاتو دەڵێت خاکی رووت رایکێشام بۆلای خۆت ، بەڵکو لە جوانیو بەهرەی نورانیت شاد ببم، بۆ ئەوەی هەر بە خاوێنی بمێنمەوە، هەروەکو چۆن ئیبراهیم پێغەمبەر(ﷺ) خاوێنە کە لەسەر ئاینی ئیسلامە.

بە جەذبەی خاڵی ڕووت بەڵکو بە باغی حوسنی تۆ شادبم
دەبێ من هەر لەسەر ئاینی ئیبراهیـــم ئازەر بـــــــم

وەفایی لەناو دەروونی خۆشەویستەکەی سینە بۆتە پارچەیەك ئاگرو گری تێبەر بووە هەروەکو چۆن کێوی سینا لەتاو پرتەوی نوری خوا بوە خۆڵەمێشو گڕی گرت ئاوەهاش سینەی من گڕی گرتووە، هەروەها چاوەکانیشم بۆتە گۆمی خوێنو خوێنی لێ دەتکێ هەروەك چەشمەی مینا:

سینەم هەموو سووتاوە لەتاو ئاوری سینا
دیدەم هەموو پڕ خوێنە لەبەر چەشمەی مینا

هیچ کەسێك کوشتەی من نیە، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە خـۆم تامـەزرۆی جـوانی بویمەو بە دوای کەوتوم، چاوەڕێش دەکەم هەتا ڕۆژی حەشر کە ئـەو ڕۆژە هـەقی هـیچ کەسیك لەسەر هیچ کەسێك نامێنێ (وەکو کورد دەڵێت هەقی بزنـی شـاخدار لەسـەر بێشاخ نامێنێ) ئەو ڕۆژەش منیش هـەقی خـۆمی لێ دەسـتێنم (چاومەسـت، بـادە، مەیکـەدە، مەیخانـە) ئەوانـە هـەموویان ڕەمـزی سـوفیەکانن بـۆ بـیری تەریقـەت بەکاریانهێناوە

کوشندەی من نەبوو هیچ کەس مەگەر سەر دائیرەی حوسنی
لە ڕۆژی حەشـرێ خوێنـــی خـــۆم لە چاوی دەســـتێنم

هەر بە بۆنەی کۆچی دوایی شێخی نەهری قەسیدەیەکی نووسیوە، بەڵام لە سەرەتادا پیشانی کەس نەداوەو بۆ کەسی نەخوێندۆتەوە، هەتا شەوێکیان لە خەونیدا لەگەڵ کۆمەڵێك کەسدا لە خزمەت نەهری دەبن، هەرکەسێك نوسخەیەکی ئەو قەسیدەی لەلایەوە دەیخوێنێتەوە، هەر لەو خەوەدا شێخ پێی دەڵێت (وەفایی تۆش نوسخەی خۆت دەربهێنە)، وەفایی دەڵێت پاش ئەو خەونە قەسیدەکەم پیشانی خەڵکیداو بلاوم کردەوە لە نێو خەڵکاندا.

هەموو خۆشەویستیو چالاکی مرۆڤ لە دنیادا بە هێزی چاوەوە دەبینرێت نوورو ڕوناکی وەفایش شێخ عوبەیدوللا نەهریە، کاتێکیش ئەو تووره نەماو کۆچی دوایی کرد، هەرچی نوورو بینایی چاوم هەبوو کوژایەوە کەواتە دنیاش بێ نوورو ڕوناکی خۆشەویستی لەزەتی نابێ

نیشاطو عوشرەتی دونیا بە نەشئەو قووەتی چاوە

ئەمن چیبکەم لە دونیایی کە ڕۆیی نووری بیناکەم ل ٧٤

لەسایەی سەری ئەو بایەی لەلای تۆوە دێت دڵو دینی جارێکی تر زیندو کردەوە بەهۆی نورو بەرەکەتی جەنابتەوە، هەروەکو چۆن حەزرەتی عیسا سلاوی خوای لێ بێت مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خوا وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ (ال عمران-٤٩)،

نەسیمی فەیضی تۆ دینو دڵی دووبارە ئیحیا کرد

درێغا وەك مەسیحا باعیثی ئیحیای مەوتاکەم ل ٧٧

زانایان دەڵێن (موت) بریتیە لە (عدم الحياة)و شتی عەدەمی خەلقو ئیجادکاری لێ ناکات خەلق بە مانای تەقدیر مردن هەرچەندە عەدەمی بێ هەر موقەدەرە لەلای خوا بریاری لەسەر دراوە.

هەندێکی تر دەڵێن شتی عەدەمی هەرچەندە لە وجودی خۆیا پێویستی بە خەلقو ئیجاد نیە، بەڵام هەر روحێ بە مەحەل بۆ پەیوەندی مردن پێویستی بە خەلق هەیە[٩].

لێرەدا وەفایی لە بابەتێکی فەلسەفی دەدوێت کە مردنی شـێخی نەهریـە، گەرچـی نەبون بۆتـە سـەبەبکار، بـەڵام وجودیـشی حەقـە، چـونکە خـوای گـەورە بـە توانـاو دەسەڵاتدارەو هەر خۆش موختارە کە وادەی ئەم ئەجەلە دەهێنێ.

عەدەم باری سەبەبکارە وجودێکی حەقە دیـــارە
بۆ خۆی فەععالو موختارە خوداوەندی تەواناکەم                ل ٧٩

هەموو موسڵمانێکی خواناس دەزانێت کە شەیتان دوژمنـــی گـەورەی موسـلمانانو پێغەمبەرە(ﷺ) (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِيْن) ئەمـەش مەعلومـەو ئاشـکرایە کـە وەفایی ئومەتی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەهلی قیبلەیە، جا هەرچۆنێك بێت پیاوی باش بێـت یان خراپ، ئەم پێغەمبەرەش گەورەی هەموو پێغەمبەرانە، ئێمە هـەموو دڵ بـە غـەم دەبین، شەیتان کەیف خۆش دەبێت، بەڵام مـن عەشـقی تـۆم هـەر لـە دڵ دایـە، گـەر سەدجاریش دەرم بکەی، من دەستت لێ هـەڵناگرم چـونکە مـن سـەگێکی تـۆم نـانی بەردەرگای تۆم خواردووە، وەفام هەیە بۆت. سەگ بەوەفایە بۆ خاوەنەکەی، جگـە لـەم دەرگایەی تۆ هیچ دەرگای تر شك نابەم :

یارسول الله دەزانی تۆ کە شـەیتانە عـــــەدوت
هەم لەتۆ مەعلومە ئەمنیش ئومەتی تۆم هەرچی هەم
کەی ڕەوایەو غیرەتە تۆ کە (فخر الانبیـــــا)ی
دوشمنی خۆت شاد بفەرمووی ئومەتی خۆت دڵ بەغەم
داغی تۆم هەرپێوەیە سەدجار دەرم کەی دێمـــەوە
من سەگێکی تۆم وەفایی ڕوو لێ دەرگای کێدەکـــەم                ل ٨٥

شەهادەت پلەیەکی بەرزە کە خودا ئەیکاتە بەشی هەندێك لـە پیـاوانی خواپەرسـت بەرامبەر بەو شەهادەتەش خودا پاداش گەورەی داناوە، کە هاوشانی شەهادەت بێـت، ئەویش بەهەشتی فراوانە، وەفایش بە دەستی ئەو شەهید بووە، کە چۆتە بەردەرگای، بۆیە دەبێت شەهیدیش بچێتە بەهەشت:

دەیفەرموو لەسەر خاکی دەری خۆی کە منی کوشت

جەننەت بەسە بۆ خوێنی شەهید نەظـــــەری من

وەفایی گوڵێك شك دەبات، بەڵام ئەو گوڵە گوڵی ئاسایی نیە کە لە باغانـدا هەیـە، بەڵکو ئەو گوڵەی وەفایی گوڵێکی مەعنەویە لە بـاغی خۆشەویـستیو ئەڤینـدا، ئـەم گوڵە لە جوانیدا هەروەکو ئەو مانگە وایـە کـە لـە دەشـتی کـەنعان دایـەو ڕوونـاکی کردۆتەوە دیارە لە ماهی کەنعان مەبەست حەزرەتی (یوسف)ـە کە لە دەشتی کـەنعان براکانی فڕێیاندایە ناو بیرەوە (و القوه فی غیابه الجب) (یوسف).

گوڵیکم بوو لە باغی دولبەریدا ماهی کەنعانی

دلێکم بوو لە ڕیزی عاشقان مەجنون بە سوتانی

من هێندە چاوەڕێی بە ئومێدی هاتنەوەی خۆشەویستەکەی خۆم بووم نەهاتەوە لـەم شەوە تووشی ماڵوێرانی بووم هەردوولام لەکیس چوو.

هەمدیسان وەفایی خۆی بە پیری کەنعان چواندووە کە حەزرەتی یەعقوبە هێنـدە بـە ئومێدی گەڕانەوەی حەزرەتی یوسف بوو لەتاواندا هـەردوو چـاوی کـوێر بـوون دەبێـت منیش وەکو حەزرەتی یەعقوب چاوەڕێی گەڕانەوەی عـەزیزێك دەکـەم دووریـش بێـت لەچاوم، کوێر نەبم وەکو حەزرەتی یەعقوب:

بە ئومێدی عـەزیزێك دوور لە چاوم پیری کەنعان بووم

بەجارێ ماڵی وێرانم ئەویشم چوو ئەمیشم چـــــوو

وەفاى وەك مرۆڤێكى خاوەن باوەڕو بڕوا پتەو بە بوونى خوا، عەقيـدەى تەواويـشى بە تاكو تەنهايى خواى گەورە هەيە، كـە هەركەسـێك بـڕواى بـەتاكو تـەنهايى خـوا هەبێتو بڵێ (لا اله الا الله) داخيلى بەهەشت دەبێت، بـا گوناهيـشى زۆر بێـت بۆيـە دەڵێت هێندە داخدارە بۆ بينينى قەدو باڵات، تۆش خۆت پيـشانبدەو بـا لـە بينينـت مەحرومو بێبەش نەبێت:

داغدارى ئەلقى باڵات با لە رووت مەحروم نەبێ

من كەفيلى وەصلى جەننەت هەرچى ئەهلى وەحدەتە

دڵدارو خۆشەويستەكەى وەفايى پەيمانى لەگەڵدا كردووە، دەرگـاى خێـرى لـە ڕوودا كردەوە بۆيە بەيعەى دا بە گيانى بۆ ئەوەى بـە بەهەشـتى شـاد بكـات، مـادام وايـە وەفايى ئەمە فرسەتێكى چاكە ئەم فرسەتە لە كيس خۆت مەدە

يار ئەوا بەيعى ويصالى ڕووى لەگەڵ تۆكردەوە

جەنـەتى داوە بە ڕوح نامەرد وەفايى فرسەتە

دڵ لە سينەى مرۆڤدايە، سينەى منيش لەتاو ئـاورى شـەوقى كـەمالى تـۆ ئـاگرى گرتووە ئەمە چ سينەيەكە؟ سينە نيە، بەڵكو كێوى سينايە ئاگرى گرتووە.

وەفايى گەلێك جارى تريش لەناو دوورى بيرەكـەى سـينەى خـۆى بـە كێـوى سـينا چواندووە كە موسا پێغەمبەر عەشقى بينينى جوانى خواى گەورە بـووە، بـەڵام لـەتاو پرتەوى نوورى خوا خۆى پێنەگيراوە، كێوەكە بووە بە خۆڵەمێشو ئاگرى گرتووە:

سينەم لە شەوقى ميهرى كەمالى تۆ

سينەم چ سينە، تاوەكو سينا پڕ ئاورە

پەروانە هێندە عاشقى ئاگرو رووناكيە بـەدەورە ئـاگردا دەسـورێتەوە، هێنـدە لێـى نزيك دەبێتەوە، تاكو باڵەكانى لە ئاگر دەداو دەسوتێ، من ئەو پەروانەيـە نـيم تـەنها ئەوەندە نەبێت عـەشقى خەندەيەكى تۆمە، خەندەيەكم بۆ بكە، تـاكو ئـەو ئـاهو ناڵـە

بیرێتەوە، چونکە ئەو دڵەی من ناگا بەو ئاگرەی لە دەروونم بەربووە هەرکەسێکیش سوتانی ئاگری نەدیبێ با مەنعی گریانم نەکات کە لەتاو ئێش‌و ئازاری ئەو ئاگرە دەگریم.سۆفیەك هاتەلای شێخ مەعروفی کرخی گوتی: خەڵکی گاڵتەم پێدەکەن کە سۆفیم، شێخ معروفیش لە وەڵامدا گوتی ئەو خەڵکە سۆفیانیان کردووە: سوفی گوتی نەخێر: شێخ گوتی با بەینێ تامی بکەن ئینجا گاڵتە بە سوفی بکەن.(١٠)

وەفایی شاعیریش بە هەمان شێوە دەڵێت گەر ئەو خەڵکە نەسوتاون بۆ مەنعی گریانم دەکەن کە من سوتاوم بەو عەشقەوە:

عاشقی خەتێکی تۆم با بەس بێ بە ئاهو ناڵە بم
بولبولم پەروانە نیم حەز بە سوتانم مەکە
دڵی من ناگا لەبەر ئاوری دەروونم دێتە جۆش
تۆ کە سووتانت نەدیووە مەنعی گریانم مەکە

لە وەرزی بەهاردا ژیان لە نوێ دەست پێدەکاتەوە، بە هۆی باران بارین‌و دەرکەوتنی تیشکی رۆژ، گیاو گوڵ سەرلەنوێ سەر لە زەوی دەردەهێنێ، دەشت‌و دەر سەرتاپا سەوز دەبێت، پاشان ئەم گیایە لە شوێنی خۆی وشك دەبێت:

دیسا نسیمی بەهار نەرم نەرم هاتە خوار
دونیای زیندوو کردەوە بە ئەمری پەروەردگار ل ٢٦

رازاندنەوەی بەهەشت بە جوانی ئەو دارو درەختە جوان‌و رێکوپێکانەیە کە مرۆڤ تێیدا سەرسام دەبێت ئەوا لەلای وەفای شاعیریش بەدوو لەبی مەستی بۆتە خاوەنی ئیعجازی حەزرەتی عیسا، کە حەزرەتی عیسا توانای زیندوکردنەوەی مردووی هەبوو بە ئیزنی خوا هەروەها چاکردنەوەی کوێرو بەڵەك:

فیردەوسی جەمالم بە نیهالی قەدی طوبام
یەعنی بە دوو لەب صاحیبی ئیعجازی مەسیحام ل ٤٦

لەلای شاعیرانی کلاسیکی کوردی برۆ وەکو نیوکەوان وایە کە بە قاب‌القوسین بـاس دەکرێت بەڵام ئەو برۆتێك نانەو دەم داخستن بەرامبەر وەفـایی نابێـت هـەبێ، چـونکە لوطفی تۆ وەکو دەریایەك وایە، هەروەکو چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لە خـوای گـەورە نزیـك بۆوە هەتا گەیشتە نزیکی خوا، تەنها (قـاب القوسـین) مـابوو کەمـەقامی بێجێگـاو شوێنی خاو دەست نیشان دەکا:

برۆت تێکنا، دەمت وێکنا لە دەریای لوطفی تۆ دوورە

لە قوربی قابە قوسێنو مەقامـــی لامەکانـــــــت بم ل ٥٣

وەفایی لە لاوانەوەی شێخ عوبەیـدوڵلای نـەهری، باسـی گـەلێك لایـەنی ئـایینیو پێغەمبەرانو موعجیزەیان دەکات، حەزرەتی ئادەم کـە خـوای گـەورە دروسـتی کـرد بردیە بەهەشتو لەوێ نیشتەجێ بوو، بەڵام ئاگادار کرایـەوە کـە لـەم دارە نـەخوا لـە دوایی شەیتان هەڵیخەڵەتاندنو دارەکەیان خوارد، خوای گەورە لە بەهەشت دەریکردنو هاتنە سەرزەوی:

بەدوای دانە بۆگیرا، بە دەریای عیلمی ئەســــــماوە

لەبەر چی هاتە خوار ئادەم لەسەر فیردەوسی ئەعلاکەم ل ٧٨٠

پەنای بۆ چ بردەبەر دار ئەو کە دەیزانی دەبێ شەقا بێ؟

نە ئاخیر صاحیبی ئایاتو موعجیز بوو زەکەریاکـــەم؟

پیری کەنعان واتە حەزرەتی یەعقوب هێندە گریـاَن لـەتاو دووری حـەزرەتی یوسـفی کوری هەتا چاوەکانی کوێر بووو روناکی تێدا نەما:

لە سیرری نوری چاوانی عەجەب بێنوورو حیکمـــەت بوو

بڵێ بۆ چ پیری کەنعانی دەگریا، نووری عەیناکــــــەم ل ٧٨

هەمو شتێك بۆ حەزرەتی سولەیمان تەسخیر کرابوو، بەهۆی ئـەو ئەنگوسـتیلەی لـە پەنجەیدا بوو، (ئاصەفی کوری بەرخیا)ش وەزیری حەزرەتی سولەیمان بوو، وەفایی دەڵێ

ئەوا ئەو ئەنگوستیلەی پەنجەی حەزرەتی سولەیمان بزر بوو، بەڵام قودرەتو حیکمەتی تۆ هەرماوە:

سولەیمان خاتەمی ون بوو لە قودرەت ماوە نە بفەرموو
بلا صەخرەی بە ئاودادام بەلا ئاصەف لەدەریاکەم          ل ٧٨

حەزرەتی موسا لەگەڵ خودا قسەی کردووە، نازناوی (کلیم)ی هەیە (و کلم موسی تکلیما) جا پێش حەزرەتی موسا چەند هەزار بێتاوان هەبوون لەسەر ڕێگای ئەویش ڕۆیشتن، جا ئەو کەسانە ڕۆژی جەزا دەبێ وەلامیان چی بێ:

کەلیم ئێستا نەبوو بوو چەندهەزار مەعصوم لە سەروی چوو
دەبێ جەوابی چی بێ ڕۆژی جەزا گوستاخی مووساکەم          ل ٧٨

سەرچاوەکان:


١- دیوانی وەفایی/لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی/ بەغدا- ١٩٧٨، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد.
٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣- بیرەوەریەکانی وەفایی/ لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی/ بەغدا - ١٩٧٨.
٤- بیرەوەریەکانی وەفایی/ لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی/ بەغدا - ١٩٧٨.
٥- الست لە شیعری شاعیرانی دێرینمان/ نەوزاد کەلهور/ ڕۆژنامەی یەکگرتوو.
٦- تەفسیری نامی/ بەرگی ٣ ، دانراوەی مەلا عبدالکریم مدرس.
٧- بیرەوەریەکانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی حەمەی حەمە باقی.
٨- تەفسیری نامی/ بەرگی ٣ ، دانراوەی مەلا عبدالکریم مدرس.
٩- تەسەوف چیە؟ شێخ امین شێخ عەلائەدین نەخشەبەندی.

# ڕەهـەندی ئایـینی لە شـیعرەکانی (ناری)

محمدی کوری مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محمدە، لە گونـدی سـاوجی کـۆن لـە نزیـك مەریوان لە ساڵی ١٨٧٤ لەدایکبووە، شاعیر بە مەبەسـتی خوێنـدن چـۆتە حـوجرەی مزگەوتەکان، سەرەتا لەلای باوکی دەستی کردوە بـە خوێنـدن، پاشـان بـە مەبەسـتی تەواوکردنی خوێندنەکەیو پەیداکردنی زانستی زیاتر گەلێك شوێنی کوردستان گـەراوە وەکو سنەو سلێمانی هـەولێر دواجـاریش چـۆتە ڕەوانـدزو کۆتـایی بـە خوێندنەکـەی هێناوەو ئیجازەی مەلایەتی لەسەر دەستی مـەلا ئەسـعەدی خـەیلانی وەرگرتـوە، لـە ساڵی ١٨٩٧زاینی کە ئیجازەی وەرگرتوە دەچێتە مـەریوان دەسـت دەکـات بـە وانـە گوتنەوەی فەقێیان، لە ساڵی ١٩٠٤ زاینی حسین بەگی بێڵـو داوای لێـدەکات بـچێتە بێڵو لەوێ ببێتە مودەرسی ئەو گوندە، ناری تاکو کۆچی دوایی کردنی لەسـاڵی ١٩٤٤ لە بێڵو دەمێنێتەوە، بۆیە بە کاکە حەمەی بێڵو ناسراوە.

کاکە حەمەی بێڵو شارەزایی هـەبووە لـەکێشو عـەرەروزی عـەرەبی، چـونکە ئـەو سەردەمە ئەم مادەیە وەکو دەرس خوێنراوە.

هونراوەکـانی نـاری لەسـەر کێـشی عـەرەروزی گـوتراوە هـەموو پیتەکانیـشی بەکارهێناوە شاعیر کەمتریش لە شاعیرانی سەردەمی خۆیو پێشتریش وشەی بێگانەی بەکارهێناوە ناری یەکێکە لەو شاعیرانەی کورد کە گرنگیەکی زۆری بەراوانبێژی داوە، کە ئەمەش یەکێکە لە خاسیەتەکانی، جگە لەوەش زمانێکی تـەڕو پـاراوی هەیـە لـە خوێندنەوەی هۆنراوەدا، ئەمـەش وای کـردووە هۆنراوەکـانی ببنـە ویـردی سـەرزمانی خوێنەران.

شاعیری کورد عەلی کەمال باپیر گەلێك سەرسام بووە بە هۆنراوەکانی ناری شاعیر، نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو شانازیش بەوە دەکا کە لە هۆنراوە نوسیندا شوێن پێی ناری هەڵگرتوە، وەکو دەڵێ:

بێ ئەدەب نابم لەلام وایە ئەگەر بێتو بڵێـــم
ئەی (کەمالی) شیعرەکانی من لەهی ناری دەکا
بەیادی طەبعی شەککەرباری (ناری) دەکـــا
غەزەلخوانە (کەمالی) بۆیە واشیرینە ئەشعـــارم

لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە شیعری ناری بریتییە لە شیعری دڵداریو ستایشو پێداهەڵدان، نیشتمانپەروەری، شیعری ئاینی وەکو ستایشی پێغەمبەر(ﷺ) یاخود سوود وەرگرتن لە کەلتوری ئیسلامی بەکارهێنانی هەندێك ئایەتو فەرموودە.

سەرەتای دیوانی ناری بە سورەتی (یاسین) دەست پێدەکات، یاسین یەکێکە لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز کە باسی گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات (یس، وَالْقُرآنِ الْحَكِيمِ، إِنَّكَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ، عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) هەروەها لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە دەربارەی گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك) دیسان هەموو ئەهلی دڵ واتە عەشقانی خودا حەز بە خۆ دەرخستنی خوێندنی سورەتی (طە) دەکەن کە ئەم سورەتەش هەر دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیوە (طه، مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى)

سوورەتی یاسین کە وەصفی حەزرەتی لەولا دەکا
ئەهلی دڵ مایل بە جیلوەی سوورەتی طاها دەکا

ئاسمان کرپارێکی زۆر بە وەفایە، ئەو ڕۆژەی لەیاد ناچێت کە پێغەمبەر(ﷺ) چوە ئاسمانو لەلای خوای گەورە دەعوەت کرا (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ

الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّه هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (الاسراء- ١).

ئاسمان وەك مشتەری هەردەم بە میزانی وەفـــا

کەسبی هەر شامی بە یادی دەوڵەتی ئەسرا دەکا

حەزرەتی عیسا بە نەصی ئایەتی قورئانی پیرۆز لە ئاسمانەکانە، بەڵام لەبەر گەورەیی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) کە چووە ئاسمان، ئیتر ئەرکی ئەو بەرز بونەوەیە دەکا:

گەر تەصەورکا مەسیحی تەختی عەرشی ئەعظەمی

تا ئەبەد ئەرکی بەیانی ڕەفعەتی عیسی دەکـــا

ئەو نوورەی لە پێغەمبەرەوە دەردەچێت، هەروەکو ئەو نورەی خودای گەورە لە کێوی طوری دا بۆ حەزرەتی موسا، هەروەها تێکەڵ بوونی موعجیوەی حەزرەتی موسا کاتێك دەستی لە باخەلیا دەنا دەستی سپی دەبوو دەدرەوشایەوە (وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ...) (طه-٢٢).

نووری عیشقی تۆ لەسەر طوری دڵی موسی مەگەر

دای لەسەر سینەی بە شەوقی دڵ یەدی بەیضا دەکا

ئەگەر خودای گەورە حەز بکاتو بیەوێت نەسیمی گوڵشەنی خۆی بدات بە خۆشەویستی خۆی لەلای زۆر ئاسانە هەرچی ناخۆشی ژیانی هەیە بیگۆڕێت بە خۆشی، هەروەکو ئەوکاتەی نەمرود بۆ تۆڵەسەندنەوەی بتەکان لە حەزرەتی ئیبراهیم ئاگرێکی گەورەی کردەوە بۆ ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم بخەنە ناویەوە، بەڵام خودای گەورە نەیویست بیسوتێنێ، بەڵکو فەرمانی دا بە ئاگر بۆ ئەوەی سارد ببێتەوە بە سەلامەتی رزگاری بێت:

بۆ خەلیلان گەر نەسیمی گوڵشەنی لوطفت ببێ

ناری نەمروودی بە سەحنەی (جەننەتو لمەئوا) دەکا

تاقی کیسرا نزیك سەلمانی پاکی ئێستا پایەتەختی فارسە ساسانیەکان بوو، بە لەدایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو تاقە شەقی برد ئاگرو روناکی فارسەکان کوژایەوە، ئەمە بەڵگە بوو لەسەر فەوتانی دەسەلاتی فارسەکان لە عێراق وە لە ساڵی ١٥ ك لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری کوری خەتاب(ﷺ) دەسەلاتیان نەما.

ناریش دەڵێت بە لە دایکبوونی پێغەمبەر(ﷺ) نورەکەی وەکو بروسك دای لە تاقی کیسرا دەسەلاتی فارسیش وەکو کەفی سەرئاو لەناو چوو ریسوا بوو.

تاقی کیسرا بۆ بە بەرقی نوری حوسنی شەق ئەبێ
سەیلی حوکمی ناری فارس زایلو ڕیسوا دەکا

سوێند بە خالقی هەموو عالەم لە ئادەمەوە کە یەکەمین کەسە تاکو دەگاتە پێغەمبەر(ﷺ) هەموو پێغەمبەرەکان یەکەیەکە دان دەنێن بە گەورەیی پێغەمبەری تۆ:

ئەی حەبیبی خالیقی عالەم لە ئادەم تا بە تۆ
ئەنیسیا یەك یەك بەیانی حەزرەتی والا دەکا

(وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) یەکێکە لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز، جا کەشف کردنو ئاشکرا کردنی ئەو شەوە بەهۆی تۆوە بووە، چونکە تۆ وەکو تیشکی رۆژ وایت هەرکاتێك تۆ بەدیارکەوتی شەو ناچێت زوناکی سەرتاپای دەگرێتەوە لێرەدا شاعیر وشەی (الضحی) بەکارهێناوە کە کاتی ئەوەی رۆژ بەقەد رمێك بەرز دەبێتەوە دەبێتە چێشتەنگاو لە هەمان کاتیشدا ئیشارەت بە سورەتی (وَالضُّحَى ۞ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى) (الضحی:١-٢) دەکات:

کاشفی (واللیل)ی طوڕڕەی پەرچەمی شەبڕەنگی تۆ
ئافتابی طەلعەت تەفسیری (والضحی) دەکا

ئینجا شاعیر باس لە گەورەییو خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات بە تایبەتی شەوڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەکەوە بۆ قودسو پاشان بۆ ئاسمانەکان (سُبْحَانَ الَّذِي

أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّه هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (الاسراء- ١):

ئایەتی مبعراجی پایەی قەوسەینت عەجـەب

وەصفی ئیفرازت لە تەختی نازی (اوادنی) دەکا

پیاوانی چاكو خواترس لەلایەن خوای گـەورەوە شـەرابێکیان دەدرێتـێ تێکەڵـە لـە زنجبیل (عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلاً) (الانسان- ١٧)، ئەو شەرابەش هەروەکو ئەو ئاوە شیرینو سازگارە وایە کە لە ڕۆژی دوایی دەدرێتـە ئومـەتی پێغەمبـەر کـە بـە ئـاوی (کەوثەر) بەناوبانگە (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) پێغەمبـەر(ﷺ) بەدەسـتی خـۆی ئـەوئاوە سازگارو شـیرینە دەداتـە دەسـت ئـەو کەسـانە کـە لـە دنیـادا لـە خـوداترس بوینـە بێفەرمانیان نەکردووە

سەلسەبیلی لوطفی تۆ بێشك لە عەرصەی مەحشەردا

توشنە لەب، قانیع لەبادەی جامی (اعطینا) دەکـــا

ناری شـاعیر دەسـتە وەسـتانە لەئاسـت باسـی وەسـفی پێغەمبـەردا(ﷺ) چـونکە پێغەمبەر(ﷺ) چاکترینی دروستکراوی خوای گەورەیە، جا ئەگەر بێتو بەسەد دەفتـەرو هەتا رۆژی مەحشەر بنوسمەوە گەورەیی تەواو نابێت

(ناری) یا وەصفی جەلالی حەزرەتی خیرالبشر

کەی بەسەد دەفتەر هەتا مەحشەر ئینشا دەکا

دنیا لەلای گەلێك لە شاعیرانی کلاسیکدا بە پیرێژنێکی جادوگەریان چـواندووە جـا مرۆڤی چاك ئەویە بتوانێت لە مەکری ئـەو پیرێژنـە رزکـاری بێـت، چـاکترین شـتیش ئەوەیە سێبەسێ تەلاقی بدەی، هەروەکو عەلی کوڕی ئەبی طالـب دەفـەرموێت: (انـی طلقتها ثلاث) (ناری) دەڵێ پیاو ئەوکەسەیە دنیای تەلاق بدا:

کەسێ دەرچوو لەدوای مەکری دنیا

کە مەردانە تەلاقی سێبەسێ ئەدا

گەردوون بۆ لەحزەیەکیش لە بەزمی خۆی ناکەوێت بە دەستورو یاسای ئەدەب شەرم لە پیاوانی خوا ناکات، هەروەکو (شـەمری)کـە سەرلەشـکری سـوپای یەزیـدی کـوری معاویـە بـوو هێرشـی کردەسـەر نـەوەی پێغەمبـەر لـە دەشـتی کەربـەلا هـەمووی شەهیدکردن لەوانەش (حسین کوری عەلی) یەکێکە لە ال العبا. پێغەمبەر(ﷺ) جارێك لەگەڵ جولەکەیەك کێشەی دەبێـت، ئـەویش عەباکـەی بەسـەرخۆیدا ئـەکاو (عـەلیو فاطمەو حسنو حسین) ئەخاتە ژێریەوە بـۆلای جولەکەکـە دەروات، پاشـان جولەکەکـە ئەترسی پەشیمان دەبێتەوە:

فەلەك بۆ گەردوشی تۆ لەحزەیە تەرکی جەفا ناکـــا
بە قانونی ئەدەب شەرمێ لە خاصانی خودا ناکـــا
مەگەر ئەو مادەرەی شمری سەگو بوجەهلی مەلعونە
کەوا قەت ئەرکی غەم پێدانی (ما تحت العبا) ناکـا

عبدالرحمن کوری ملجم بکوژی عەلی کوڕی ئەبی طالب، ئەم کابرایە دەچێتە شـاری کوفە لە نزیك شاردا ئافرەتێك دەبینێت بەناوی (قطام) حەزی لێدەکاو دەچێتە داخوازی بەڵام ئافرەتەکە دەڵێت مارەیەکم لەسـەر (٣) هـەزار دینـارو عەبـدێکم بـۆ بکـری و، مەرجێکی تریش کوشتنی (عەلی کوڕی ئەبی طالب)ـە، چونکە کەسو کاری لەشـەری نەهروان کوژرابوو لە دژی عەلی شەریان دەکرد، پێك دێن دەچێت عەلی شەهید دەکـا، فرزدق شاعیر عەرەب دەڵێت:

و لم أر مهراً سافه ذو شـــجاعه   کمهر قطام من فصیع و اعجـــم
ثلاثه الاف و عبد و قینــــــه   و ضرب علی بالحسام المســـــم
ولا مهر اغلی من علی و ان علا   ولا فتك الادون فتك ابن ماجـــم
ولاغرو وللاشراق ان ظفرت بـــه   کلاب الاعادی من فصیح و اعجم
فحربه وحشی سقت حمزه الـــروی   وحنف علی من حسام ابن ملجم

جەرگی ابن ملجم پارچە پارچە بێت کە هیچ ڕەحمێكو سۆزی لەدڵدا نیە کە هێرش

دەکاتە سەر عەلی ئەیکوژێت:

به تەرزی ئیبنو مەلجەم پارەبێ جەرگی کەوا ڕەحمـــێ
بە ئاهو سوزشی سینەی حەزینی مورتەزا ناکـــــــا

شاعیر یەقینی وایـە ابـن ملجـم زۆر تێنـووە بـەخوێنی ئـەولادی پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەمەش وادەکات کە هیچ ترس لەدڵدا نەبێت:

یەقینم وایە توشنەی خوێنی ئەولادی موحەمەد بوو
کە قەت خۆفی لە هەنگامەی خرۆشی کەربەلا ناکا

روداوی کەربەلا گەلێك شتێکی گەورەیە بەلای موسڵمانانەوە چـونکە لـەم شـەرەدا نەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) هـەموویان شـەهیدو لەناوچـون بـە فـەرمانی یەزیـدی کـوری معاویە، ئەو لەشکرەی حسین گەلێك پەرێشان بوون لە تێنوان بۆیە دەڵێن (من سقانی، قد نجا) هەرکەسێك هەندێك ئاوم بـداتێ رزگـاری دەبێـت لـە رۆژی حەشـردا، چـونکە لەشکری حسین سەرچاوەی ئاویان لێگیرا بوو

حوسەین ئاسا لە مەوجی خوێن دا پەیوەســتە فەرموویە
دەسا بۆکەس خەیاڵی (من سقانی قد نجا) ناکـــــــــا

ناری پەیوەندی توندو تۆلی لەگەڵ بنەماڵەی شێخ مـەحمودی حەفیـدا هـەبووە، لـە هۆنراوەیەکدا کە بۆ شێخ بابە عەلی نوسیوە، شاری بەغـداد دەشـوبهێنی بـە میـسرو شێخ بابەعەلی بە یوسفی دووەمو دەڵێـت ئاگـاداری خـۆت بـە نـەوەك بکەوینـە داوی عەزیزێك چونکە حەزرەتی یوسف کاتێك گەیشتە میسرو چووە ماڵی عەزیزی میـسرو خێزانەکەی کە زولێخا بە حەزی چوە یوسف خەریك بوو تووشی گوناهی گەورەی بکات (قالت هیت لك) یوسف بەلام یوسف خۆی نەدا دەست:

بەغدا کە وەکوو میسرە ئەتۆ یوســـفی ثانی
وریابە نەوەك یاری عەزیزێ بە نیهـــــانی
بتخانە ئەنێو مەکرو فسـوونێکی زوبـــــانی

(شق القمر) لەت کردنی مانگ یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك قورەیشیەکان داوایان کرد مانگیان بۆ لەت بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) بە پەنجەی ئیشارەی کردو مانگ دوولەت بوو (اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ) (القمر- ١)

ناری دەڵێت پارێزەری شەو رۆژ لەلای روح الامین ئەو بوو هاوڕێو یاری لە سەفەری شەویدا، لێرەدا شق القمر ئیشارەیە بۆ پێغەمبەری مەزن (ﷺ):

حافیظی ڕۆژو شەوت (روح الامین)

یاوەری تۆ صاحیبی شەققولقەمەر

هەر لە شوێنێکی تردا دەربارەی (شق القمر) دەڵێت:

وەها چاکە لە میعراجی وەفادا

لە ڕووتانا بەلەب شەققولقەمەر کەم

شاعیر پاکانە بۆخۆی ئەکات کە دوورە لە هەموو ئیشێکی خراپ، بۆیە داوا دەکات کە بە قسەی مرۆڤی ناپاك قەد بڕوا نەکەن گوێ لە قسەی پیاوی خراپ نەگرن، چونکە سوێند بەخودایەی کە عالم الغیب ئاگاداری هەموو شتێکەو شاهید کەمن وەکو حەزرەتی یوسف بێگوناهە تاوانم، هەروەکو چۆن زولیخا بوختانی بە حەزرەتی یوسف کرد ئەوها بەختان بەمن دەکرێت.

زولێخا خێزانی عەزیزی میسر حەزی لە یوسف کرد کە لە ماڵی ئەودا کاری دەکرد، تاکو ڕۆژێك هەموو دەرگاکانی لەسەر یوسف داخست (وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ وَغَلَّقَتْ الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ) (یوسف- ٢٣):

عالیمولغەیبیم خودایە بۆ گەواهی من کە وەك

یوسفی سیدیقی میسریمو لە توهمەت بێبەریم

دیسان دەربارەی عەشقی زولیخا بۆ جوانی یەسف دەلێت بۆ پەیدا بوونی شـەوکەتی مرۆڤـ دەبێت هەوا خواپەرستی هەبێت هەروەکو جوانی یوسف بـوە ڕەواج بـۆ عەشـقی زولیخا بۆی (وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ) (یوسف- ٣١):

لەبۆ ئەربـابی شەوکەت لازمە زیبی هەواخـــــواهی

ڕەواجی حوسنی یوسف، شۆڕشی عەشقی زولەیخا بوو

هاروت‌و مارووت دوو کەس بوو هەندێك دەلێن دوو مەلائکەن، هەنـدێکیش دەلـێن دوو پاشان بەلام زۆرباش بوینە بە مەلائکە بەناوبانگن (وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِـلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ):

ئەگـــەر هارووت‌و مارووتن لەچاهی زیللەتا جـــوتن

بە فیتنەی چاوی مەستی پڕخوماری ژن نەبوو چی بوو؟

قابیل‌و هابیل مندالانی حەزرەتی ئادەم دەستیان کردن بـە کوشـتنی یـەکتر، قابیـل هابیلی کوشت، چونکە حەوا بە زگێك کورو کچێکی دەبوو، کچی یەکـەم ئـەدرا واتـە مارە دەکرا لە کوری دووەم، لەسەر ئەوە ڕێك نەکەوتن (فَطَوَّعَـتْ لَـهُ نَفْسُهُ قَتْـلَ أَخِيـهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنْ الْخَاسِرِينَ) (المائدة- ٣٠).

ئەگەر قابیل بە قاتل بوو لە حەق بێ مایل‌و غافل بوو

سەبەب گوڵزاری ڕوخساری عوزاری ژن نەبوو چی بوو؟

حەزرەتی یوسف کاتێك خۆی نەدادەست زولێخا ڕای کرد بـەرەو دەرگـا زولێخـا لـە پشتەوە کراسی ڕاکێشا (وَاسْتَبَقَا الْبَـابَ وَقَـدَّتْ قَمِيـصَهُ مِـنْ دُبُرٍ وَأَلْفَيَـا سَـيِّدَهَا لَـدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُـوءًا إِلاَّ أَنْ يُـسْجَنَ أَوْ عَـذَابٌ أَلِيمٌ) (یوسـف- ٢٥)، پاش ئەوە چەند ساڵ کەوتە زیندانەوە ئەویش بە هۆی مەکرو داوی ژنەوە بوو:

لە زیندانی جەفادا، بێ صەفا ما، ماهی کەنعانی

بەمەکرو داوی تەزویری بەکاری ژن نەبوو چی بوو؟

ئاوی کەوثەر ئەو خەڵاتە گەورەییە کە دراوە بـە پێغەمبـەر(ﷺ) چـونکە کافرەکـان دەیانگوت (ابتر) واتە وجاغ کوێر، خوای گەورەش لە جیاتی ئەوە خەڵاتی کرد بە ئـاوی (کەوثەر) جا ئەگەر ئاوە مەنع کـراوە لەعاشـقانی خـوا، ئـەوە بۆچـی ئـەولیا خـەمی هەرگەورەیانە تاکو بگەنە سەر ئەو ئاوەو لیّ ی بخۆتەوە:

ئەگەر کەوسەر لە عاشق مەنعە بۆچی

خەمی زولفی کەمـــەندی ئەولیـــا بوو

ئەو شۆخە نەخشینە کاتێك تیری مـوژەی خـۆی داوێـت زۆر بێمروەتانـە بەرامبـەر خۆی تیرباران دەکاتو دەیکوژێت بەمەش دەبێتە شینو ڕۆڕۆ.

سورەتی یاسین (یس والقران الحکیم) ئەو سورەتەیە کاتێك مرۆڤـ لـە سـەرەمەرگدا بێت بەسەریدا دەخوێنرێت، کاتێکیش مـرد تـەلقین دەدرێـــتو بەمـەش دەبێتـــــە شینو ڕۆڕۆ.

لەبەر تیری موژەی بێمروەتی ئەو شۆخە نەخشینە

لەهەرجێ دەنگی یا تەلّقینە، یا یاسینە، یا شینە

حەزرەتی عیسا موعجیزەی ئەوە بـوو کـوێرو بەلـەكو نەخۆشـی چـاك دەکـردەوە، هەروەها مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خوا (أَنِّـي أَخْلُـقُ لَكُـمْ مِـنْ الطِّـينِ كَهَيْئَـةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِـإِذْنِ اللَّـهِ) (ال عمران- ٤٩).

وەکو لە پێشەوە باس لە (ال العبا) کرا پێغەمبەرو نەوەکانی عەلیو فاطمەش، جـا ئەوە چ ئینسانێکە لەلای تۆ ئالی عەبا واتە پێغەمبەر(ﷺ)و مـالو منـداڵی تووشـی زیللەت بن بەدەستی کافری بەدزاتەوە:

بۆ ئینسانە لەلای تۆ زومرەیی ئالی عەبـــا

قەیدی زیللەت بێ بە دەستی کافری بەدزاتەوە

موعجیزەی حەزرەتی موسا گۆچانەکەی دەستی بوو کاتێك فڕێی دەدا دەبووە ئەژدیهای گەورە لە دژی ساحیرەکانی فیرعەون، فیرعەون داوای لە سیحر بازەکانی خۆی کرد کە پێشبکرێ بکەن لەگەڵ موسا خەڵکیان کۆکردەوە (وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنْتُمْ مُجْتَمِعُونَ، لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ إِنْ كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ، فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ قَالُوا لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ، قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ، قَالَ لَهُمْ مُوسَى أَلْقُوا مَا أَنْتُمْ مُلْقُونَ، فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ، فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ) (الشعراء- ٤٥).

موعجیزەی (موسی) لە ڕووی دا سیحرو جادوو چی دەکا

هیممەتی ڕۆستەم ببێ ئەفگەنی گورگین چی یە؟

مانی گەورەترین وێنەکێشی فارس بووە، مانی ڕەنگی داوەتەوە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی، زۆربەی شاعیرانی کورد باسی (مانی)یان کردووە، نەقاشەکانی چین شوێن دەستو پەنجەیان دیارە لە هونەری نەخشەسازی، بەڵام هەرکاتێك جوانی حەزرەتی یوسف بێتە پێشەوە جوانیو زینەتی شیرین چیە؟

نەقشی مانی دەرکەوێ نەققاشی چین ریسوا دەبێ

حوسنی یوسف جلەوگەربێ زینەتی شیرین چیە؟

شاعیر وەکو مرۆڤێکی خاوەن باوەرو عەقیدەیەکی بتەو خۆشەویستی پێغەمبەری لە دڵدا چەسپاوە لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووەو فەرمویەتی ئیمانی تەواو نابێت ئەو کەسە هەتا منی لە هەموو کەس خۆشتر نەوێ، جارێك عومەری کوڕی خەتاب عەرزی پێغەمبەر(ﷺ) ی کرد تۆم لەهەموو کەس خۆشتر دەوێت تەنها خۆم نەبێت، ئەویش فەرمووی هێشتا ئیمانت تەواو نیە، عومەر گوتی ئێستا تۆم لەهەموو کەسێك خۆشتر دەوێت هەتا نەفسی خۆشم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئێستا ئیمانت تەواو بوو.

ناری ئەو خۆشەویستیەی هەیە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە لە پێنج خشتەکیدا ستایـشی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) دەکات بە شاهەنشاو گـەورەی دنیـاو قیامـەتی دادەنێـت وەکـو گەوهەری زێڕ تاجەو لەسەری نراوە، ڕۆژێکی پرشنگدارە لـەنێو هـەموو پیغەمبەرانـدا یاخود پێغەمبەرانی تر ئەستێرە بن ئەویش ڕۆژ بۆیە هەرکاتێك ڕۆژ دەربکەوێ زونـاکی هەموو ئەستێرەکان ون دەبێت، بـەهاتنی ئـەو پێغەمبـەرە(ﷺ) هەرچـی شـەرعیەتی پێغەمبەرانی پێشوو هەبوو بەتاڵ بوو (وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُـوَ فِي الآخِرَةِ مِنْ الْخَاسِرِينَ)

ئەی شـــەهەنشاهی شکوهی عیززەتـــی روویی زەمین

گەوهەری تاجی ریسالەت، شەمسی بورجی مورسەلین

شەوی ئیسراو میعراج یەکێکە لە مـوعجیزە گـەورەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) کـە لـە شاری مەکە بۆ بيت المقدس لەوێشەوە بۆ ئاسمانەکان، ئەو شەوە هەموو مەلك کەوتنـە ئاهەنگ گێڕان، هەر ئەو شەوە عەرش‌و کورسی بوە تەخت‌کورسی ئەو پێغەمبەرە ﷺ:

ئەی شەوی ئەسرا مەلەك خوررەم لەبۆ ئاهەنگـــــــــی تۆ

عەرش‌و کورسی بوو بە تەخت‌و مەسنەدی ئەو رەنگی تۆ

هەر ئەو شەوە کە تۆ سـەرکەوی بـۆ ئاسمانـەکان بـاخ‌و باغـاتی بەهەشـت هـەموو شەرمەزاربوو لەجوانی تۆ، بۆ دلّدانەوەی زاتی تۆ ئەوها ڕێزمان گرتی بەرەنگی دەنگ:

گولشەنی جەننەت خەجالەت ما، لە جیلوەی ڕەنگی تۆ

بۆ نەوازش زاتی حەق هەم سوحبەت‌و هەم دەنگـــی تۆ

تۆ وەکو مانگی، هەرکاتێك هەلّدێی وەکو مانگ ئەدرەوشـێیتەوەو وەکـو مـۆم وای لـەنێوان سـەرجەم پێغەمبەرانـدا روناکیـت دیـارە لـە دوورە بـەهۆی ئـەو روناکیـەوە ئەناسرێیتەوە:

پرتەوی بەدری جەمالت، شەمعی جەمعی ئەنبیا

زینەتی حوسنی کەمالت سۆزی شەوقی ئەولیـــا

ئینجا بەوپەڕی تەواضوعەوە ناری شاعیر بەراوردی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەکات دەڵێ من گەداو بێنەوام، لە بەرامبەرمدا تۆش خاوەنی جوانی گەنجی دەسەڵاتی‌و خاوەن سەخاوەتی من چ لە سزا بکەم کە بێ‌هەواو پەشیمانم، جا جگە لەتۆ چ شتێکی تر هەیە من رووی تێ بکەم ئەی شەفاعەت کاری کۆمەڵەی خراپکاران :

من گەداو بێ‌نەوا، تۆش خاوەنی گەنج‌و کەریـــــم
من نەخۆش‌و بێ دەوا هەر تۆی دەوابەخش‌و حەکیـــم
چی لە هەنگامی جەزا کەم بێ هەوا خواهو نەدیـــم
روو لە کوێ کەم غەیری تۆ ئەی شافعی زومرەی لەئیم

شاعیر کەوتۆتە شیوەن‌و قوڕپێوان کە عومرێکی درێژی بەسەر بردووە، بەڵام تەمەنێکی بێ بەرهەم کە هیچ زەخیرەی ڕۆژی دوایی کۆنەکردوەتەوە، بۆیە دەبینین دەستەو ئەژنۆ دانیشتوە وەك منداڵێکی هەتیوی بێ‌دایك کە هیچ کەسێك نیە دەستی میهرەبانی بەسەردا بهێنێ، جا ئەویش لە داخانا هیچی بۆ نەماوەتەوە تەنها ئەوەندە نەبێت، دانیشێت فرمێسکی تەر بڕێژێت‌و سەرتاپای لەشی خۆی لە قوڕ دەگرێ، هەتا ئەو کاتەی (شای لولاك) مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لە حەدیثی قودسیدا هاتووە (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك) دێ ڕزگارم بکات.

با بکەم شیوەن لەداخی باخی عومری بێ‌سەمەر
دەستە ئەژنۆ دابنیشم وەك هەتیوی بێ پـــــدەر
با بە ئەشکی دیدە تەڕکەم خاك‌و خۆڵی راگـوزەر
خۆ لەقوڕ بگرم بە جارێ هەر لەپێ تا تەوقی سەر
بەلکی لوتفی شاهی لەولاك بێ نەجاتم دا لەشین

ناری شاعیر کەوتۆتە ژێر دەستی هەواو نەفسی خۆی، ئەو نەفسەی کە هەردەم مرۆڤ بەرەو شتی خراپ دەبات (وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّي) (یوسف)، تیشوی ڕێگاشی لا نیە بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایدا رزگاری بکات،

چونکە لە رۆژی مەحشەردا روتو بێچارە کە هیچی لەلا نیە تەنها ئەوەندە نەبێت رەحمەتی زۆری پێغەمبەر(ﷺ) شك دەبات چونکە لەو ڕۆژەدا (شفیع المذنبین)ـە. پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت لە عەرزی ابوذر الغفاری دەکاو دەڵێت (یا اباذر اعد اسفینه فان البحر عمیق فستکثر زاد فان السفر طویل):

بوردەباری دەستی نەفسی کافری ئەممارە خۆم
بێزەخیرەو زادی رێگەی ئاخیرەت بێچارە خۆم
دەستەپاچەو رووسیاەو عاجزو بێکارە خۆم
رووتو قوتی مەحشەرو بێ سایە وو ئاوارە خۆم
بێ بەفریادم لەوێدا یا دەلیلەلمجرمین

سەرەڕای ئەو هەموو خراپەکاریەی کە هەمە، بەڵام ئومێدم زۆرە بەو ئایەتەی کە خوای گەورە (لاتقنطوا من رحمة الله).

من کە مەشهورم بە مەحکومو موتیعی نەفسی شوم
کەی بە ئومێدو خەیاڵی ئیعتبارو ئابروم
قەت لە فەرمانی ئیتاعەت یەك قەدەم پێشو نەچوم
ئێستە من قانیع بە خۆشەی ئایەتی (لاتقنطوا) م

ئەو سەگەی لەگەڵ کۆمەڵی یارانی ئەشکەوت کەوت (وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ) (الکهف)، ئەو سەگە لە بەهەشت دەبێت دەچێتە بەهەشتەوە، ناری دەڵێت ئەو لە بەهەشت من لە دۆزەخدا دەبم، دە ئەی خۆشەویستی هەموو دروستکراوەکان تاکو زووە بەزەییە بۆمان بنێرە، ئەگەر ئەو سەگی اصحاب الکهف بووە، منیش سەگی تابعینم:

گەر سەگی دوای فەوجی خاسانی خوایی کەوتووە
یانی دەربارەی دەری ئەصحابی کەهفی گرتووە

ئەو لە جەننەتدا موقیمو من لە دۆزەخـــدا بووە

ئەی حەبیبی خالیقی عالەم تەرەحوم تـــا زووە

ئەو سەگی ئەصحابی کەهفو من سەگێکی تابعین

ناری سەفەری کۆچکردنی نزیك بۆتەوە وردە وردە خەریکـە هـەنگاوی بـۆ دەهـاوێ، بەڵام مەنزلی گەلێك دوورو درێژەو ڕێگاکەشـی پڕمەترسـیە، جـا کەوایـە بـۆ هێنـدە غافڵی ئەی خاك بەسەر، برۆ هەتا زووە ڕوو لە بارەگای پێغەمبەر(ﷺ) بکـەو گـەلێك بپاڕێوەو بڵێ ئەگـەر باشـترین دروسـتکراوی جیهـان، ئێمـە زۆر بـە ئـیخلاص شـوێن هەڵگری سونەتەکانی تۆین لەخۆتمان بژمێرە.

(ناری) یا ئامادەیە نزیکە هەنگامی ســـــەفەر

مەنزڵت دوورو درێژو چۆڵە ڕێگەت پڕخەتــــــەر

تا بکەی غەفڵەت نوشینی خاکی، ئەی خاکت بەسەر

ڕوو لە ڕەوزەی موستەفا کە بێژە یا خەیرولبەشـــەر

نیمە توێشەی ڕێگە جوز ئیخلاصی خەیرولبەشـــەر

سەرچاوەکان:

١- دیوانی ناری/ کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی پێشەکیو لەسەر نوسینی کاکەی فەلاح ١٩٨٤.
٢- نورالابصار فی ماقب ال البن المختار.

# بێــخــود

بێخـود (١٨٧٥-١٩٥٥) شـاعیرێکی زمـان پـاراوو تـەرزمانی کـوردە، هـەروەها یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکەکانی کورد، بـە کۆچـکردنی بێخـود ئەسـتێرەیەکی تـری شیعری کلاسیکی کوردی بەرەو نەمانو ئاوابوون چوو، یاخود بـە مانایـەکی تـر بڵـێین دواچۆڕەکانی شیعری کلاسیکی کـوردی لـە دەریـای ئـەدەبی کـوردی بـەرەو کۆتـایی دەڕۆیشت.

شاعیر لە سەردەمێك لەدایکبووە، کە خوێندنی حوجرە سوختەخانە بـاوی هـەبووە، لە هەمانکاتیـشدا لـە خێزانێکـی زانـاو ئایینپـەروەر لـەداکبووە هـەر لەمنداڵیـەوە مێشکی بە بیری ئایینیەوە زاخاو دراوە، کاتێکیش تەمەنی گەیـشتۆتە (٦-٧) سـاڵان هەروەك منداڵانی سەردەمەکەی خۆی چۆتە بەر خوێندنو فێری ئیملاو نەحوو صـەرفی زمانی عەرەبی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا شـارەزایی پەیـدا کـردووە لـە زمـانی فارسـیو تورکیدا، هەروەها شارەزایی لە زانستەکانی ئایندا، کاتێکیش خوێندنی تەواو کـردووە لە ناوچەکانی کوردسـتاندا بـە مامۆسـتایەتی خـەریك بـووەو دەرسـی گوتۆتـەوە بـە تایبەتی لەپاش ئەوەی لە جێگای کاکی بۆتە موفتی، کەواتە لەو ڕۆژەوەی پێە ناوەتـە حوجرە تاکو ڕۆژی کۆچکردنی سەرقاڵی کاروباری ئـاینی بـووە، بۆیـە دەبیـنین زۆر بـە ئاشکرایی کاریگەری ئاینی بە شیعرەکانیەوە دیارە، یاخود بە مانایەکی تر بڵێین ئـاین لە شیعرەکانی بێخود رەنگی داوەتەوە.

ئەگەر بێتو چاوێك بە دیوانەکەیدا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێت زۆربـەی شـیعرەکانی لاوانـەوە بـووە بـۆ پیـاوانی ئـایینیو دۆسـتەکانی یـاخود پیـا هـەڵگوتن بـووە بـۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانی وەکو خەلیفە راشدین(ﷺ).

بێخود توشی موبتەلای هەواو نەفسی خۆی بووە، مەعصیەتو گوناە تـەواو باریـان کردوە دەردی بێدەوایە، بەڵام هێندە بەسە بۆ شاعیر کە پێغەمبەرﷺ پشتو پەنایەتی ئەو پێغەمبەرەی کە بە مـوعجیزە کارمـامز شـاهیدی بـۆ داوە کـە پێغەمبـەری ﷺ خوایە:

بەدەس هەواو نەفسەوە ئەگەرچی بەندە موبتـــــەلام
هیلاکی باری مەعصیەت کەلاکی دەردی بـــێدەوام
بەڵام ئەمەم کیفایەتە کە نەعت خوای موســــتەفام
خولاصە من لە هەردوو لا کەسێکە مەلجەئو پەنام
کە گفتوگو بە وەحشی یو غەزالو سوسەمار ئەکـــا

نزاو پاڕانەوەی موسا پێغەمبەر لەسەر کێوی طور کـە خـوای گـەورە نـووری خـۆی پیشان بدات کاتێکیش کەمێك لە نوورەکەی خستەسەر کێـوی طـور کێوەکـە سـووتا، دوای ئـەم بەســەرهاتە دێتــە سەرباســی پێغەمبــەر(ﷺ) کــە چـۆن ئـادەمی فریـشتە صەلاوات لەسەری لێ دەدەن پاشان بە موعجیزەی خـۆی بـە هێمایـەك مـانگ شـەق دەکا.

قورەیشیەکان داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کە موعجیزەیـەکیان پیـشان بـدات، داوای ئەوەیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە مانگیان بۆلەت بکات پێغەمبـەر(ﷺ) بـە پەنجـەی مانگی شەق کرد، خەڵکەکە هەموو ئەوەیان دیت، قورئانیش ئیسپات دەکات (اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ) (القمر)، بێخودیش دەڵێ:

هەتا تەجەللی خودا لە عالەما بکـــــا ظهــــــور
بە ئاگری گوڵی چەمەن چیا ببێتە کێــــــــوی طور
فریشتەو ئادەمی ئەڵێن هەتا ئەبەد لە خـــــوارو ژوور
صەڵاتی حەق لەسەر شەهێ کە شەق ئەکا قەمەر لە دوور

لە کۆنەوە دروست بوونی ئادەمیزاد بۆتە جێگای مشتومڕێکی زۆر، ئایا سەرەتای دروست بوونی ئادەمیزاد چۆن بووە، خوای گەورە لە قورئاندا ئەم باسەمان بۆیەکالاّ دەکاتەوە هەروەکو لە سورەتی (السجده) دەفەرموێ: (الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ) (السجده- ٧).

بێخود لەژێر کاریگەری ئەم ئایەتە دەڵێت:

قوربانی ئەو خودایە کە دوڕڕێکی وا یەتیم

بەشەوچرای ئێمە لە ماءو لە طین ئەکا

شەڕی خەندەق لەنێوان قورەیشەکانو موسڵمانەکان ڕوویدا، مەبەستی قورەیشەکان ئەوە بوو بە یەکجاری موسڵمانەکان لەناوببەن، بۆیە هێرشیان کردەسەر شاری مەدینە، موسڵمانەکان لەسەر پێشنیاری سەلمانی فارسی خەندەقیان لە دەوروپشتی شاری مەدینە لێدا، هەموو موسڵمانان کاریان تێدا کرد، پێغەمبەر(ﷺ) کەمێك ئاوو کەمێك جۆیان بۆهێنا، بەبەرەکەتی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) توانی هەموو ئەو خەڵکە تێرئاوو خواردن بکات، کە موسڵمانەکان سەریان لەوکارە سوڕما، ئەم موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) لە شیعری بێخود بەم شێوەیە ڕەنگی داوەتەوە:

ئەگەر لە فەیضی ئەو نەبێ دوو هۆقە جۆو یەك چتێر

چلۆن لەڕۆژی خەندەقا کیفایەتی هەزار ئەکا     ل ٤

لەشەوی ئیسراو میعراجدا پێغەمبەر(ﷺ) چووە ئاسمانەکان تاکو گەیشتە سدرەالمنتهی (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى، عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى) (النجم- ١٤)، کە ئەمەش یەکێکە لە گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەدەیەها موعجیزەی تری هەیە:

تۆ سیدرەنشین بازی، صاحێبی صەد ئیعجازی

پێغەمبەری مومتازی، دەستی منو دامانت     ل ١٧

شەقکردنی مانگ بە پەنجەی پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی بەڵگە نەویستە، کاتێک قورەیشیەکانداوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئەویش ئەو داوایەی بۆ جێبەجێکردن:

بەیضا بە ئەمری ئەو بوو کەوەستا دەقیقەیێ
دوولەت بەدەستی ئەو بوو کە مانگی ئیشارە کرد    ل ٢٥

دیسان دەربارەی شەری خەندەق بێخود دەڵێ:

ئەو بوو کە یەك چیترو مەنێ جۆ لە خەندەقا
ڕۆژی غەزا کیفایەتی بەو یەك هەزارە کرد    ل ٢٥

بێخود لە پێناسەی گەورەیی‌و ئیعجازی پێغەمبەر(ﷺ) دیسان دەڵێت:

بە تیغی ڕەمزو ئیعجازی کەمەندی
مەهی شەق کردو بەستی باڵی (خورشید)    ل ٢٤

بێخود نەك هەرخۆی دەکاتە قوربانی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو خۆی دەکاتە قوربانی ئەو کەسە کە قوربانی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت، ئەو بەندەیەش وەکو سەگێك دەبێتە دەرگەوانی شاهی عەرەبی واتە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو شاهەش نەسەبی قورەیشیە، جەرگ‌و دڵی منیش بەستراوە بە خۆشەویستی ئەوەوە.

قوربانی کەسێ بم کە بەقوربانی نەبی بێ
وەك بەندە سەگی دەرگەهی شاهی عەرەبی بێ
شاهی عەرەبی یەعنی قورەیشی نەسەبی بێ
جەرگی بە دوو ئەبرۆی ئەوە چنراوە دڵی من    ل ٦٨

بێخود زۆر وەستایانە باسی وەفاو دڵسۆزی (ئەبوبەکری صدیق) دەکا کە چۆن گیانی خۆی فیدا کرد لە ڕێگەی پێغەمبەر(ﷺ)دا کە چۆن بەیەکەوە کۆچیان کرد، پاشان ئەبوبەکر لەپێش پێغەمبەر(ﷺ)دا چووە ناو ئەشکەوتەکەوە، هەموو کونەکانی ناو ئەشکەوتەکەی گرت تەنها یەك کون نەبێت، ئەویش قاچی خۆی لەسەر دانا بۆ ئەوەی

هیچ زیندەوەرێك زیان بە پێغەمبەر(ﷺ) نەگەیەنێ، لە ئەنجامدا مارێك بەپێی پیرۆزی ئەبوبەکریەوەدا، ئا ئەمەیە گیان فیداکردن لە ڕێگەی بیروباوەڕدا، خوای گەورەش واباسی ئەو کۆچە دەکا (إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا) (التوبة- ٤٠).

خوصووص خەلیفەی یەکەم رەئیسی فیرقەی ئیهتدا
کە ئەو بوو کردی رۆحی خۆی لە رێی صەداقەتا فیدا
کەسێ کە پێی موبارەکی بخاتە ژاژی ئەژدەها
لەبەر رەسولی موحتەرەم نەوەك گەزەندی پێبگا
یەقین بزانە ئیشی وا لە ئیشی یاری غار ئەکا

لەپاشان دێتە سەرباسی خەلیفەی دووەم (عومەری کوری خەتاب) کە ناوبانگی بە دادپەروەری لە هەموو جیهاندا بڵاو بۆتەوە، لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا خەڵك زۆر بە ئەمینی ژیاوون، جا لێرەدا دەبینین بێخودی شاعیر پەندێکی کوردی پڕبەپێستی ئەم دادپەروەریە تێکەڵ بە شیعری خۆی کردووە کە پەندەکە دەڵێ (گورگو مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە) هەرچەندە گورگ زۆر برسی مەڕە، بەڵام کاتێك دادپەروەری بڵاوبۆوە مەڕ لە گورگ ئەمین دەبێت، کە ئەمەش دیارە هەر لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب روو دەدات:

لەپاش ئیمامی نامەوەر (عومەر) خەلیفەی زەمین
درەختی مەعدەلەت سەمەر چەمەن طیرازی شەرعو دین
هەر لە عەصری عەدلیا مەڕە لە گورگ ئەبێ ئەمین
لە جێگەیێ جەنابی ئەو کە بوو ئیتر سەگی لەعین

ئینجا نۆرەی خەلیفەی سێیەم (عوسمانی کوڕی عەفان)ـە، خاوەنی شەرمو حەیا، کە چۆن هاتووە لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)دا سوودی وەرگرتووە، کە فریشتەکانی ئاسمان شەرمیان لە عوسمان کردووە (روی عن علی (ﷺ) قال دخل عثمان علی النبی

(ﷺ)و رکبته بادیه فغطی رسول الله (ﷺ) رکبته، فقیل دخل ابوبکرو عمرو علی فلم تفطها؟ فقال رسول الله (ﷺ) الا استحی ممن استحیت منه الملائکه):

لە وەصفی خازنی سووەم یەگانە گەوهەری حەیـــا
ئیمامی مەجمەعی ئەدەب، خەطیبی مینبەری حەیا
هەرچی بڵێم خەجاڵەتم لە شەرمی جەوهەری حەیـــا
کەسێ کە دابڕا فەلەك لەڕێی ئەودا سەری حەیـــا

لەپاش کۆتایی هاتنی شەرمو حەیای خەلیفەی سێیەم، دەست دەکات بە تەواوکردنی خەلیفەی چوارەم (عەلی کوڕی ئەبی تالـب) کـە خۆشەویـستی پێغەمبـەر(ﷺ) بـووە، وەسفی ئەم بەڕێزە دەکات بە ئایـەتی (وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا) (سورەتی انسان)، کە بە (هل اتی) دەست پێدەکا لە شانی (عەلی)و فاتیمـەی خێزانیدا هاتۆتە خوارەوە، لە پاشادا باسی ئەو فەتحە گەورەیە دەکات کە فەتحی قـەڵای خەیبەرە، بەسـەرکردایەتی (عـەلی کـوڕی ئـەبی تالـب) فـەتح کـرا، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی بەیانی ئاڵای ئیسلام دەدەم بە یەکێك لە ئێوە کە فەتحی قەڵای خەیبەر دەکا، بۆ بەیانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی کوا عـەلی؟ ئاڵاکـەی دادەسـتو بـەڕێی کـرد لـە راستیشدا فەتح کرا:

لەگەڵ کەسێ حەبیبی خۆی خوا کە بووی عینایەتی
بەیانی وەصفی ئەو ئەکا لە (هل اتی) بە ئایـــەتی
غەزەنفەرێکی وا کەوا درا هیدایـــــــــــــەتی
لەڕۆژی فەتحی خەیبەردا بە زۆری شانو رایەتـــــی

دیسان هەر دەربارەی (عەلی)و قەڵای خەیبەر دەڵێت (عەلی) قەڵای خەیبەری فەتح کردو، ئەو شمشێرەی بەدەستیەوە بوو، ناوی (ذوالفقار) بووە، کە پێغەمبـــــەر(ﷺ)

دەربارەی عەلیو شمشێرەکەی دەفەرموێت: (لا فتی الا علی لا سیف الا ذوالفقار):

بادی برۆی ڕەسولی خودا بوو بە یــــــــــاوەری
حەیدەر کە فەتحی خەیبەری بەو (ذوالفقار)ـە کرد

دیسان دەربارەی عوسمانی کوڕی عەفان کە دوو کچی پێغەمبەری(ﷺ) مارە کردووە (روقیەو ام کلثوم) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی کچی تریشم هەبوایە لێم مارە دەکرد (لو ان لنا ثالثه لزوجناك):

بۆچی نەبێ بە صاحیبی نوورەینی نەبیرەیــــن
عوسمان کە بۆنی دوو گوڵی لەو نەوبەهارە کرد

ئینجا نۆرەی پیاوێکی فارسیە کە ناوی سەلمانی فارسییە، مهاجرو انصار هەریەکەیان دەیانگوت سەلمان لە ئێمەیە، تاکو قسە گەیتە پێغەمبەر(ﷺ)و فەرمووی (سلمان منا اهل البیت):

بڕوانە چۆن بە ڕوتبەی (منا) خەڵات کــرا
سەلمان کە هاتوو بەیعەتی بەو تاجدارە کرد

ئەو شەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەدایکبوو، پارچە نوورێك سەرتاپا دنیای ڕوناك کردەوە هەر ئەم نوورە بوە هۆی کوژانەوەی ئاگری ئاگرپەرستان ە شەقکردنی تاقی کیسرا، دیسان هێماکردن بە گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) (انطقت نار المجوس وانشقت ایوان کیسرا).

بە ظاهیر بوونی طاقی کیسرەوی نەتدی کە چی پێهات
قەمەر نازانێ چۆن بوو بەیەك ئیحای پێغەمبــــــــەر

حەزرەتی (ئیبراهیم) سلاوی خوای لێ بێت کاتێك لە خەودا فەرمانی پێکرا کە خۆشەویستەکەی واتە حەزرەتی (ئیسماعیل)ی کوڕی سەربڕێت:

شۆخی کە یەك موژەی بە مەثەل بۆ ذەبیحی من
صەد خەنجەری خەلیلی بەدایم ســـــــــــوامە

ئەو کاتەی کە شاعیر دڵ پڕلەغەم دەبێت پەنا بۆ حەزرەتی یوسف دەبات، کاتێك ئەو گرانیەی بەسەر خەڵکی میسردا هات بۆماوەی حەوتساڵان یوسف پێغەمبەر دڵی خەڵکی دەدایەوە کە سەبر بگرن هەموو تەنگانەیەك خۆشی بە دواوەیە (قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدْتُمْ فَذَرُوهُ فِي سُنْبُلِه إِلاَّ قَلِيلاً مِمَّا تَأْكُلُونَ ۞ ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلاَّ قَلِيلاً مِمَّا تُحْصِنُونَ) (یوسف ٤٧,٤٨)

ئەوەندە مەحوی غەمم ئەی ئەزیزی میسری بەلاغەت

دەهانیَ یوسفی ثانی صیفەت، نەماوە نیشانم

شاعیر هێندە عاشقی ڕێبازەکەی بووەن خۆی وەکو عەشقەکەی زولێخا دێتە بەرچاو بۆ یوسفی بەجێماوی دەشتی کەنعان:

لە کەنعانی فیراق و جان گودازیدا وەکو یەعقوب

لە میصری ئیشتیاق و عیشق باویدا زولەیخا خۆم

حەزرەتی یەعقوب لەتاو دووری یوسفی کوڕی چاوەکانی کوێر بوو، کاتێك کراسەکەی یوسفیان هێنا یەعقوب فەرمووی (وَلَمَّا فَصَلَتْ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَنْ تُفَنِّدُونِي) (یوسف- ٩٤)، کاتێکیش مژدە هێنەرەکە کراسەکەی گەیاندە حەزرەتی یوسف و بەسەر چاویاندا هێنا ڕووناکی بۆ چاوی گەڕایەوە (فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا) (یوسف- ٩٦).

دەمیَ بوو چاوەڕێی مژدەی قودوومی ئێوە بوو (بێخود)

خودا کردی نەسیمی پیرەهەن بۆ پیری کەنعان هات

کاتێك براکانی حەزرەتی یوسف بردیان بۆ شوون بزرکردنی بە فێڵی سەیران، پاشان هەڵیاندایە نێو بیرو دوایی کاروان هات یوسفیان دەرهێنا و لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ مصر فرۆشتیان، چەند ساڵێك بزر بوو لە باوکی دابڕا کەس نەیدەزانی سوراغی لەکوێیە (قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لاَ تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ

السَّيَّارَةِ إِنْ كُنتُمْ فَاعِلِينَ) (يوسف- ١٠).

بۆچی نەڕژێ سەیلی سروشکم وەکو بـــــاران
بۆچی وەکو یەعقوب نەبمە شوهرەیی شـــــاران
لەو یوسفە پرسیومە لە بێگـانەو یـــــاران
هەرگیز نی یە ســـــۆراخی لە هیچ لاوە دڵی من                ل ٦٧

ئەو کاتەی کاروانەکەی (یوسفی)یان دەرهێنا لەبیر، بردیانە میسر، فرۆشتیان (وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنْ الزَّاهِدِينَ) (يوسف- ٢٠)

یوسف مەتاعی من نی یە لێم لادە ئەی عەزیز
سەودای نگینی خەتمی ریسالەت بەناومـــــە
بۆ گۆشەیێکی تیغی برۆی وەك ژنانی میصـــر
پەیوەستە ئارەزووی لەپی دەستی بڕاومـــــە

بێخود پەرێشانە لەتاو دووری شێخ مەحمودی نەمر، هەروەکو چۆن یەعقوب گـەلێك پەرێشانی یوسف بوو، بەڵام لە دوایی یوسـف بـە دیـداری یـەعقوب شـاد بـوو، شـێخ مەحمودیش لە ئاوارەیی هیندستان گەیشتەوە کوێت بەم زوانەش بـە دیـداری دۆسـاتن شاد دەبێتەوە

عاجز مەبە بێخود کە ئیشەڵڵا وەکو یەعقوب
نەزدیکە ویصالی مەهی کەنعانی کـــووەیتم                ل ٤٥

پەپولـە سـولەیمان هـەواڵگری حـەزرەتی سـولەیمان بـووە، کـە سـولەیمان خـاوەنی ئەنگوستیلە بووە، بـەهۆی ئـەو ئەنگوسـتیلەوە هەمووشـتێکی بـۆ فەراهـەم کـراوە، بێخودیش دەڵێ مەگـە مـن لێـت دوورم بـەهۆی هودهـود هـەموو شـتێك دەزانێـت، هەروەها بەهۆی ئەنگوستیلەکەیەوە هەموو شتێك جێبەجێ دەکرێت:

واتێ مەگە دوورم لەتۆ ئەی صاحیبی خاتـەم
هەر هودهودەکەی بەزمی سولیمانی کووەیتم                ل ٤٥

هودهودی حەزرەتی سولەیمان توانی هەواڵی بەلقیسی شـاژنی یەمـەن بـۆ حـەزرەتی سولەیمان بهێنێ، ئەمە وای کرد سولەیمان دەست بەسەر مـولکی یەمـەن بگرێـت (قَالَ يَاأَيُّهَا المَلاَ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ) (النمل- ٣٨).

گەر هودهودەکەی بادی صەبا بێ لە (سەبا) تان

گەر تەختی (سـولەیمان)ی یە ئەیخـاتە هـەواتان ل ٦١

بێخود چاوڕونی لەخۆی دەکات ئەوکاتەی نامـەی (نـوری شـێخ صـالحی) بەدەسـت گەیشتوە، نامەکەی بە کراسـەکەی حـەزرەتی یوسـف چـواندووە، کاتێـك بـۆ بـاوکی ناردەوە، حەزرەتی یەعقوب ڕۆشنایی بـۆ چـاوەکانی گەرایـەوە، چـونکە لـەتاو دووری یوسف کوێر ببو:

لەپاش حەمدو ثەناو شوکرو سوپاسی حەزرەتی بێچوون

لەپاش صەلوات و تەسلیمی شەفیعی ئوممەتی جـــانی

وتم ئەی خەططو خامەت سورمەی چاوی مەهجـووران

وتم ئەی بۆیی نامەت بۆیی جامەی ماهی کەنعانـــی ل ١٢٢

یوسفی میصر هێندە جوان بووە لەلای شاعیر بۆتە مـانگ و وەکـو مـانگی چواردە شەوە دەدرەوشایەوە، بێخود دەڵێ گەردی بەرپێی خۆت بۆ لێم قەدەغـە دەکـەی، مـن هەروەکو حەزرەتی یەعقوبی باوك چاوەڕێ تۆزێکی ئەو گەردەم کە بـۆم بنێـری و چـاوم پێ ڕووناك ببێتەوە.

گەردی ڕێت تاکەی لە (بێخود)مەنع ئەکەی ئەی ماهی میصر

چاوی ئەم یەعقوبە موحتاجـــی جەواهێر ســـــــــورمەیە ل ١٥٢

پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕەحمەت بۆسەر ئادەمیزاد ڕەوانە کراوە، ئاینەکەی کۆتایی ئاینـە هەتا ڕۆژی حەشر بەردەوام دەبێـت، ئـەم ئاینـەی زینـدوو کردۆتـەوە، هـەروەکو چـۆن حەزرەتی (عیسـا) مردوی زیندوو دەکردەوە (وَتُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ

الْمَوْتَى بِإِذْنِي) (المائدة- ١١٠).

ئیحیای مەسیح ئەگەر نەفەسێ بوو، جەنابی ئەم
تا ڕۆژی (یوم ینفع) ئیحیای دین ئەکـــــــا    ل ١١

حەزرەتی عیسا خوای گەورە ئەو موعجیزەی دابووێ کە کوێرو کەڕو مردوو زینـدوو دەکردەوە بە ئیزنی خوا، دەڵێن سامی کوڕی حەزرەتی نوحیشی زیندوو کردۆتەوە:

بشمرم خاکم لەپاش صەدساڵ ئەڵی وەك (سام) ی (نووح)
ئەی مەسیحا چاوەڕێی یەك مرحەباتم، ڕوحەکـــــــەم    ل ٥٧

مزگەوت ماڵی خودایە، ئاوەدانکردنەوەی لەلایەن خەڵکەوە دەبێتە مایەی خێرێکـی زۆر، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَـنْ آمَـنَ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِرِ) (التوبة- ١٨)

بەباڵی (انما یعمر) کە گەییە ئەوجــــی (من امن)
(امان الله) لەداخ ئیحسانی ئەو ڕوحی شکاتی کرد    ل ٣٠

یارانی ئەشکەوت چەند کەسێك بوون، لەترسی دەقیانووس پاشای ستەمکار هـەلات بۆ ئەشکەوتێكو خۆیان یا حەشاردا، سەگێکیان لەگەڵدا بوو بەناوی (قطمیر) ٣٩ سـاڵ تیادا مانەوە (أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًـا) (الکهف- ٩)، بێخود شاعیر خۆی بەو سـەگە دادەنێـت کـە نـاوی قطمیر بـووەو پاسـەوانی لـە اصحاب الکهف کردووە بەڵام (اصحاب الکهف) ی بێخود شێخانی بیارەن.

ئەمن (قطمیر) ی ئێوەو، ئێوە (اصـحاب الکهف) ی من
لەبۆ کەهفی ئەمانت وا ســـەگی دەرگانەکەی خۆت هات    ل ١٤

هەریەك لە حەزرەتی عیساو موسی موعجیزەی خۆیـان هـەبووە، حـەزرەتی عیـسا فووی ئەکرد بە مردوودا زیندوی ئەکردەوە (وَإِذْ تَخْلُقُ مِـنْ الطِّـينِ كَهَيْئَـةِ الطَّيْـرِ بِـإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَـوْتَى بِـإِذْنِي) (المائدة- ١١٠).

هەروەها حەزرەتی موسی دەستی لەباخەڵیا ئەناو کاتێك دەریدەهێنا سپی دەبوو ئەدرەوشایەوە(وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْرَى)(طه-٢٢)

هێندە بۆ ئیحیای دڵی مردوو یەدی بەیضای هەیە
گاورو جووش پێی ئەڵێن مووسا دەسەو عیسا دەمە ل ٨٨

دیسان دەڵێت:

یەدی بەیضای بەغەل پەروەردەیی ئیعجازی شوخێکە
لە عەینی نەصڵی شەودا صاحێبی صوبحی گریبانە ل ٩٠

شاعیر گەلێك دوورە لە خۆشەویستی بەڵام چ دووریەك تاکو رۆژی مەحشەر بەیەك ناگەن ئەو حەسرەتەی دووریەشی دەمێنێتەوە تاکو لێدانی نەفخی صور (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنْ الأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ) (يس ٥١)

چ دووری؟ دوورییێ تا رۆژی مەحشەر
چ حەسرەت؟ حەسرەتێ تا نەفخی صوور ل ١١٢

ئەو رۆژەی خوای گەورە دنیای دروست کرد، ئەرواحی خەڵکی کۆکردەوە فەرمووی (الست بربكم) الاعراف، خەڵکەکەش لە وەڵامدا گوتیان (قالو بلى) بۆیە بێخود گلەیی دەکاو دەڵێ ئێوە هێندە بێرەحمن بەرامبەر بەمن دەڵێ ئاسنگەری رۆژی (الست) دڵو دەروونی ئێوەی لە ئاسن گرتووە:

هێندە بێرەحمن ئەڵێی ئاسنگەری رۆژی الست
دەرحەقی من لەوحی دڵتانی لە ئاسن کردووە ل ٩٤

# صـــافـــی

صافی ناوی کاك مستەفای کوڕی کـاك عەبدوڵلایـە، لـە هـیران لـە سـاڵی ۱۸۸۳ لەدایك بووە، وە لە ساڵی ۱۹٤۲هەر لە هیرانی مەڵبەندی لەدایکبوونی کۆچی دوایـی کردووەو، لە گۆرستانی بنەماڵەکەیان نێژراوە.

صافی هیرانی بەمەبەستی خوێندن گەلێك شوێنی کوردستان وەکـو کۆیـەو ڕەوانـدز کوردستانی ڕۆژهەلآت گەراوە، تاکو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

صافی هیرانی جگە لەوەی مەلایەکی ئیجازە پێدراو بووە، شێخی تەریقەتیش بـووە کە ئەو تەریقەتەشی لە باوكو باپیرانی بۆ ماوەتـەوە، دەڵـێن شـێخ سـولێمانی بـاپیرە گەورەی، گـەورەو فـەرمانڕەوای ناوچـەی هـیران بـووە، بـەڵام لـە ئەنجامـدا وازی لـە میریەتیو فەرمانڕەاییی هێناوەو، ڕێگای دینداری گرتووەو پابەنـدی تەریقـەتی قـادری بووە، کە لە شێخ تەهای بەتلیسییەوە بۆی هاتۆتە خوارەوەو، کاك مستەفای (صـافی) شاعیریش هەرلەسەر ئەو تەریقەتە ماونو دابونـەریتی خواپەرسـتیو شـێخایەتیان لـە هیران هەر لەباوە[1].

صافی هیرانی پاش مردنی کاك عەولای باوکی دەبێتە جێنشینی تەکیەی قادری لـە هیران، بەمەش قۆناغێکی نوێ لەژیانی کەسایەتی صافی دەسـت پێـدەکا، پـێش ئـەو مێژووە صافی هیرانی خەریکی خوێندنی مەلایەتی بووە، هیچ ئەرکێکی تەریقەتی لـە ئەستۆدا نەبووە، بۆ ئەوەی لەدایکبوونیو ئەرکێکی گران بخاتە ئەستۆی ئـەویش کـاری ئیرشاد بووە، دیارە شیعرەکانیشی لە چوارچێوەی ئەو بازنەیەدا دەخولێتەوە کە بازنـەی سوفیزمە.

شاعیر لە تەمەنی ٣٠ساڵیدا دەبێتە جێنشینی باوکی عالەمی مادی وەلا ناوە بۆ عالەمی (مەعنەوی[٢]) هەولی داوە.

شاعیر خاوەنی بەهرەیەکی شیعری بووە، لە تەمەنی (١٤) ساڵیدا دەستی بەشیعرگوتن کردووە.[٣]

جوانی سروشتی کوردستانو سازگاری ئاوو هەواکەی لەلایەكو لەلایەکی تریش کاك عەبدوللا (ثانی)ی باوکیو نیهانی شاعیری کۆیە کاریان لێ کردوەو دەرگای شیعریان ۆب کردۆتەوە.[٣]

صافی شاعیرێکی دڵ تەڕو هەست ناسك بووە، هۆنراوەکانی زۆربەیان بەدەنگو ئاوازی گۆرانیبێژان لە کۆڕو کۆبونەوەکانو ئاهەنگە تایبەتیەکان گوتراون، گەلێك جاریش صافی لەو ئاهەنگە تایبەتیانە ئامادە بووە، کەواتە ئەوە دە مانگەیە نێتە ئەو قەناعەتە کە بلێن صافی شاعیر زیاتر هەستی موسیقی بەهێز بووە هۆنراوەکانی موسیقای بەهێزیان هەبووە.

صافی هۆنراوەکانی لە بابەتی سۆفیزم هۆنیوەتەوە، بەڵگەش ئەوە گەلێك زاراوەی سۆفیزمی لە هۆنراوەکانی بەکارهێناوە وەکو (باز، وجود، جیلوە، تجلا، عشق.. تاد) صافی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) بە پیرەوو رەشیدی خۆی دەزانی، ئومێدێکی زۆریشی بەو پیرە هەیە کە پێی شاد بێو رەزامەندی خواش بەدەست بهێنێت:

ئومێدی زۆر هەیە (صافی) نەجاتی بێ لەغەم چونکە<br>دەلیل مەولاو ئەحمەد یاوەرو یاربازی گەیلانە

خوای گەورە رێزی لە پێغەمبەر(ﷺ) گرت داوەتی کرد بۆلای خۆی هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێت: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّه هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (الاسراء- ١)، ئەو سیرە گەورەیە کە غەیری گەورەیی تۆ نەبێ کە خەتمی ریسالەت بەتۆ کەرەم کراوە

مۆری گەورەیی کۆتا پێغەمبەری(ﷺ) بەتۆ بەخشراوە:

سیری (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى) نیشانەی شاهیدت

توررەیی خەتمی ریسالەت، مۆری فەرمانی تووە

ئەو گەورەییەو شەرەفە تەنها بە تۆ دراوە، لە ڕۆژی حەشر شەفاعەت کارو تکاکاری خەڵکی گوناهکاری ئومەتی، جگە لەتۆ کەسی تر ئەو شەرەفو گەورەییەی نیە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا بە ئیزنی خودا دەفەرموێت (انا لها) من بۆ ئەوکارە تەرخان کراوم یاخود من ڕێگە پێدراوم.

ڕازی (لی وقت مع الله) خاصی تۆیە ئەی حەبیب

عاصیان بۆیە ئومێدی حەشرو میزانی تووە

ئەو خاکەی کە تۆ پێی لەسەر دادەنێی، خاکە ژێر پێیەکەت کە وەکو کل وایە، کە چۆن مرۆڤی نەخۆش لەچاویان دەکەن بۆ شفای چاویان، شاعیر ئەو ئایەتەی تێکەڵکێشێ هۆنراوەکەی کردووە کە خودای گەورە دەفەرموێت (مازاغ البصر):

خاکی ژێری نەعلەکانت، کوحلی (مازاغ البصر)

تووتیای (چشم)ی بەصیرەت، گەردی دامانی تووە

خودای گەورە خەلقی هەموو شتێکی کرد لەبەر گەورەیی‌و خۆشەویتی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەکو خودای لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: (لولاك لولاك لما خلقت افلاك)، ئەگەر تۆ لەدایك نەبویتایە بونەوەرمان خەلق نەدەکرد، کەواتە مادام تۆ هێندە گەورەیی ئادەمیزاد لە خۆشەویستی تۆ خەلق کراوە، هەموو خەلق بە قوربانی تۆ بێت:

خەلقی ئەرواحی هەموو عالەم بە نتیجەی حوببی تۆن

ئەی هەموو ئەرواحی عالەم بێ بە قوربانی تۆ

خودای گەورە ئەرواحی ئادەمیزادی کۆکردەوەی پێیانی فەرموو (الست بربکم) ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیان (قالوا بلی) ئەوا روحی منیش بەستراوە بە راحی تۆوە لە

عالەمی ئەرواح:

روح مەستە بە راحی تۆ لە نێو عالەمی ئەرواح
باطن لە (بلی) دایە (ظاهر) لـــــــە (نعم)دا

صافی شاعیر هێندە دڵسۆزە بۆ پیری تەریقەتەکەی، بۆیە دەڵێت گەدایی تۆ گەلێکم پێخۆشترە لەوەی کە لەریزی شاهاندا بم، هەرکاتێکیش کە گەدای تۆ بم ئەوکاتە ئەوەندە بەسە کە ببمە قوربانی ژێر پێی دەرگات.

شاعیر لە قۆناغی (فناء فی الله) کە یەکێکە لە قۆناغەکانی سۆفیزم (کل من علیها فان) شاعیر لێرەداتواوەتەوە لەناو خۆشەویستی خودادا، لەناو ئەو خۆشەویستیەدا ئاگاداری هیچ شتێك نیە تەنانەت ئاگاداری خۆی نیە جگەلە خودا.

گەدایی تۆم گەلا بۆ خۆشترە لەو مەسنەدی شاهی
ئەوەندەم کافییە قوربان کە عەبدی ژێری دەرگاهم

شێخ عەبدولقادر کە دامەزرێنەری تەریقەی قادریەو صافی شاعیر سەر بەو تەریقەتەیە نازناوی (باز الاشهب) پێدەڵێن، شاعیر دەڵێت من ڕاوی هەڵۆو شاهین بۆ ئەوەش نەهاتومەتە ڕاو، بەڵکو من بە دوای ڕاوکردنی کەو دەگەڕێمو وێڵو سەرگەردانی ئەوم:

بۆ شکاری مورغی وەحشی نەك هەڵۆو شاهینم
عەشقی چاوی بازی خۆمم بۆیە ڕاوی کەو دەکەم

لە شوێنێکی تردا دیسان شاعیر نازناوی (باز)ی بەکارهێناوە کە نازناوی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)یە، شاعیر دەڵێت ئەو دڵەی من کە وەك باڵندەیە ناتوانێت لەو سنورەی خۆی دەرچێت، چونکە پیرەکەم توانای ڕاوکردنی سەد باڵندەی هەیە، لە توانای مندا نیە:

طەیری دڵ لەم ناوە دەرناچێتو ئەو حەددی چییە
چونکە بازە کە نەخچیری سەد شـــاهین دەکــــا

(خاتەم) واتە ئەنگوستیلە، مەبەست ئەنگوستیلەی حەزرەتی سولیمانە، کە بەهۆی ئەو ئەنگوستیلەوە هەموو شتێکی بۆ جێبەجێ کراوە، هەر بەهۆی ئەو ئەنگوستیلەشەوە، گەربێتو داوای جامی جەمشیدیش بکات، چونکە جەمشید بەهۆی ئاوێنەکەیەوە گوایە هەموو دنیای بینیووە، بۆیە پیرەکەی منیش ئەلقەی لێوی وەك ئەنگوستیلە وایە داوای هەر شتێك بکات بۆی مەیسەر دەبێت:

لەعلی لێوی شاهیدە مولکی دڵم خاصی ئەوە

حەقیە گەر بەو خاتەمە دەعوای جامی جەم دەکا

هەرگیز ئێوە مەڵێن پیرەکەی صافی بێوەفایەو، بەهیچ شێوەیەك ڕووناداتە صافی، ئەوە خەریکە لەداخی ئەو گوێپێنەدانەی خۆی دەکوژێ، بەڵام من بەوە ڕازیم بمکوژێو نەمکوژی من هەموو کاتێك ئامادەم خۆم بکەمە فیاکاری ئەو پیرەم:

قەط مەڵێن یار بێوەفایە وا بەناحەق دەیکوژێ

بیکوژی یا نەیکوژێ (صافی) فیداکاری دەکا

لێرە شاعیر شوێن پێی مەحوی شاعیری هەڵگرتووە، کە ئەویش ئامادەیە بۆ پیرەکەی:

بیبێ یا نەیبێ من دادوبێدادی دەکەم

گوێ بداتێ یا نەداتێ ئاه فەریادی دەکەم

حەققی ئیخلاصە بەجێهێنانی ئادابی خولووص

پێبزانێ یا نەزانێ من بەدڵ یادی ئەکەم

صافی شاعیر تووشی نەخۆشیەك بووە، ئەویش دوورکەوتنەوەیتی لەیار، دیارە هەردەردێکیش دەرمانی خۆی هەیە، دەرمانی ئە نەخۆشیەش ئەوەیە کە یار بێتەسەری و دەستێك بەسەر برینەکەیدا بهێنێت بەمەش شیفای بۆ دێت:

ئەی ڕەفیقان عیللەتی دووریمە دەستم لێ مەدەن

قەت شیفای نایێ برینم تا نەگاتە دەستی یار

عەشقی صافی بۆ یارەکـەی وەکـو ئەوەیـە کـە مارێـك خـۆی لەگـەردەنی یـەکێك ئالاندبێ بەهیچ شێوەیەك لێ نەبێتەوە، ئا بەم شێوەش عەشقی یار لە گەردەنی صـافی ئالاوە رزگاری نابێت هەرچەند هەوڵو کۆشیش دەکەم بێ ئەنجامـە:

طەوقی عشقی ویم لەگەردندا نەجاتیم بۆ نییە

کوششی بێ فایدەیە یادی خەلاصی رسـتگار

شاعیر شانازی بەوە دەکات کە گەدای یارە، چ بـاکی بـە پادشـاهی نیـە، بـە هـیچ شێوەیەکیش چاوی لە دەوڵەتو دنیا نیە، گەر چاوی یاری لێوە دیار نەبێت:

من گەدایی کۆچی یارم پادشاهیم کەی دەوێ

دەوڵەتی دونیاو قیامەت بۆ چمە بێچاوی یار

وەفایی شاعیریش لەدێرە هونراوەیەکدا بۆ شێخ عوبەیدوللا نەهری دەڵێت:

هەتا ڕۆژی ئەبەد قوربان لەسەر عەهدی قەدیمی تـــۆم

بەهەشتم لێ حەرام بێ گەر بەبێ رووی توی تەمـەناکەم

من وا ئولفەتم بە تۆوە گرتووە بە هیچ شێوەیەك بەبێ تۆو دووری تۆ بۆ کـەمێکیش سەبوریم نایەت، کەواتە دەبێت تۆ هەردەم لەبەرچاوم بی فەراموشیم بەتۆوە دێـت گـەر سەدجاریش لەبەردەرگای خـۆت دەرم بکـەی بەناچـاری دەگەڕێمـەوە لات چـونکە تـۆ دۆستی هەمیشەیی:

ئەگەر سەدجار دەرم کەی قەت بەبێ تۆ صەبرەکم نایێ

بەزوویی دێمەوە دەرگانەکەت ئەی دۆست ناچــــارم

دیسان وەفایی لەم بارەیەوە دەڵێت:

داغی تۆم هەر پێوەیە سەدجار دەرم کـەی دێمــــەوە

من سەگێکی تۆم وەفایی ڕوو لە دەرگــای کێ دەکـەم

شاعیر روو لە دڵدارەکەی دەکاتو دەڵێت تۆ وەکو چرایەك وای، دەسوتێی شەوم بۆ رووناك دەکەیتەوە، هەرکاتێکیش ئەو مۆمە بکوژێتەوە رووناکی نەمێنێت رۆژی رووناکیش تاریك دادێت، کەواتە تۆ رووناککەرەوەی بینایی چاوەکانمی هەروەکو ئەو مانگەی لە ئاسماندا دەدرەوشێتەوە دنیای رووناك دەکاتەوە:

ئەگەر شەمعی ویصالی تۆم نەبێ رۆژم شەوی تارە

بینایی نووری چاوانم ئەتۆی ماهی ضیـــــادارم

خودای گەورە گەلێك ناو صیفاتی هەیە لەوانە (رحمنو رحیم) هەروەکو دەفەرموێت (بسم الله الرحمن الرحیم) کە لێرەدا هەردوکیان سیفەتی خودای گەورەن، هاتووە خودای گەورە لەسەد بەشی رەحمەتی خۆی یەکێکی رەوانەی سەرزەوی کردووە ئەوانی تری بۆ رۆژی دوایی هەڵگرتووە، جا ئەگەر خەڵکی بزانێت خاوەنی ئەو رەحمو بەزەییەی کەسێك سەجدەت بۆ نابات:

لە صەفحەی عیشقەوە گەر (سرّ)ی رەحمت بێتە نێو عالەم

هەتا مەحشەر چ کەس سەجدێکی نابا شاهی غەفـــــارم

حەزرەتی یوسفی کوڕی حەزرەتی یەعقوب لەلایەن برایەکانیەوە خرایە نێوبیرەوە (وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ) (یوسف)، پاشان لەلایەن کاروانێکەوە لەناو بیرەکە هێنایانە دەرەوە لەگەڵ خۆیان بردیانە میسر، پاش ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانەدا مایەوە، کە ئەم بەسەرهاتە درێژە لە قورئانو کتێبەکانی تەفسیردا هەیە، پاشان بووە گەورەی میسر (اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الأَرْضِ) لەپاشان زولیخای ژنی عەزیزی میسر حەزی لێکرد، شاعیر هەوڵی داوە ئەم بەسەرهاتە دەخاتە قاڵبێکی شیعری جوانەوەو دەڵێ من ماهی کەنعانم هەیە (دەبێت مەبەستی پیرەکەی خۆی بێت کە شێخی گەیلانیە)، کەواتە من چیم داوە لە سەوداسەری زولیخاو یوسف:

موڵکی میسرم بۆ چییە؟ گەر ماهی کەنعانم هەبێ

چیم لە بازاڕی زولەیخا یوسفی سەودا دەکـــــــەم

شاعیر هەر شێت‌و شەیداو مەستی یارەکەیەتی کە (باز الاشهب)ـە واتە پیری گەیلانیە، بۆیە هەردەم لەژێر چاودێری ئەودا خەریکی خوداپەرستیە:

مەیلی من هەر مەستی‌و رەندی‌و شاهید بازیـــە

وا لەبەر میحرابی ئەبرۆت طاعەت‌و تەقوا دەکەم

شاعیر گەلێك بێزارە لەدەست دنیا، چونکە ئەو دنیا گەلێك هیچەو هەرچی بەدکرداری هەیە تێدا ئەنجام دەدرێت.

قوتابخانەی سروشتی (جان جاك رۆسۆ) پێی وایە سروشتی مرۆڤ خاوێنە بەلام کاتێك تێکەلاوی ژینگە دەبێت، ژینگەی بەرەو خراپی‌و بەدکرداری دەبات، صافی شاعیریش گلەیی لە زەمانە دەکات، بەلام بۆ خۆپاراستن شکایەت کردن پەنا بۆ شاهی بغداد واتە گەیلانی دەبات، چوننکە ئومێدێکی زۆری بە شێخ عەبدولقادری گەیلانی هەیە کە بیپارێزێ لە دنیای بەد کردار:

من لەدەست دەورانی (دون)و عالەمی وا بەدعەمەل

روویی شەکواو (تواضع) بۆ شەهی بەغدا دەکـــەم

هیران گەرچی شوێنی لەدایکبوونی (صافی)یە، بەلام ئیمڕۆ ئەو هیرانە بۆتە پارچە ئاگرێك‌و دراوسێ دۆزەخە، خۆپاراستن لە ئاگرە کارێکی زەحمەتە بۆیە دەبێت پشت بەخوا ببەستێ ئەگینا زەحمەتە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە هۆی چییە شاعیر مەلبەندی لەدایکبوننی خۆی لای بۆتە پارچە ئاگرێك؟

(صافیا) هیران وەکوو نیرانە جیرانی جەحیم

سا کە وابێتن (توکل) دائیما بە خودا دەکەم

(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ) نەفخی صور ئەو دەنگەیە کە حەزرەتی ئیسرافیل لە رۆژی دوایی لێیدەدا دنیا خەراب دەبێت،

پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت: (چۆن دڵم بەغەم نەبێت کە ئیسرافیل بلندگۆیەکەی لە دەستە)؟

شاعیریش دەڵێت: لە رووبی رەحمو بەزەییەوە جارێك بنوارە حاڵی ئێمەمانان کە موشتاقی تۆین کە لە ڕۆژی نەفخی صور کە ڕۆژی حەشرە دەنگمان دەروات بۆ ئاسمان:

لە روویی رەحمەوە جارێ بنوڕە حاڵی موشـــــتاقان

کە نالەی وان بەسانی نەفخی صورەو حەشرە رووی داوە

رۆژی حەشر واتە دنیا خراپبوون، ئەو رۆژەش کە هات ئیتر ژیان نامێنێت ئە رۆژە چ رۆژێکە دیارە هەڵاتنی شەوقی جوانیت هەستانی رۆژی مەحشەرە ئاوابوونی عومری منیش نەمانی ژیانە:

لە شەرقی شەوقی وەصلت شەمسی عومرم وا غرووبی کرد

لەمەولا چۆن ئەبێ ژینم کەوا مەحشەر هەڵســـــتاوە

یارەکەم وەکو دەریایەك وایە هێندە قوڵە لە عەشقی حەقیقی، منیش وەکو غەواصە (واتە ئەو ئامێرەی دەچێتە ژێرئاو کەشفی ژێردەریا دەکا) بە نەزانی خۆم خۆم پێداداو نەمزانی کە هەزار غەواصی وەکو من لە قوڵی ئەو دەریایە گێژو داماوە:

لە بەحری عەشقی ئیظهاری غەواصیم کردو نەمزانی

هەزار غەوواصی وەك من لەو عەمیقی گێژە داماوە

حەزرەتی ئەیوب سەلامی خوای لێ بێت، تووشی نەخۆشی بوو، لەسەر ئەم نەخۆشیە سەبرو ئارامێکی زۆری گرت، لە کتێبەکانی تەفسیردا هاتووە ژنەکەی داوای لێکرد کە لەبەر خوا بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی شیفای نەخۆشیەکەی بدات، ئەویش لە وەڵامدا گوتی چەند ساڵ لەش ساغ بویمە ئەوەندە ساڵە با نەخۆش بم، ئینجا لەبەر خودا دەپاڕێمەوە بۆ ئەوەی شیفام بدا، حەزرەتی نوحیش تەمەنی گەلێك درێژ بووە لە قورئاندا هاتووە کە (٩٥٠) ساڵ بەتەنها بانگەوازی بۆ خواپەرستی کردووە (ولبث فیهم الف سنة الا

خمسین عاما) شاعیر دەڵێت: مـن نـە ئـەو سـەبرەی حـەزرەتی (ئـەیوب)م هەیـەو نـە تەمەنی حەزرەتی (نوح)، تەمەنی من پێنجو دوو ماوە کە روح رۆیشت نایەتەوە:

صەبری (ئەیوب)م لەکێ بوو عومری نوحم چۆن ئەبێ
پێنجو دوو ڕۆژێکم ماوە روح کەچوو نایێتـــــــەوە

یەدی بەیـضا واتە دەستی سپی ئیشارەیە بۆ موعجیزەی حەزرەتی موسـی (سـڵاوی خـوای لێ بێـت) هـەرکاتێك دەسـتی لـە باخـەڵیا دەنـاو دەری دەهێنـا سـپی دەبـو دەدرەوشایەوە (وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ)

یاری منیش بەدەستی بـەیـضای خـۆی هـات تەلـسمی دڵمـی گـرت بـەو هـەموو ئیعجازەوە مەیلی بەلای جادو دەڕوا:

یار یەدی بەیضای هەیە هاتو تەلیسمی دڵمی بەست
بەو هەموو ئیعجازە وامەیلی لە جادوو کاریـــــــە

خودای گەورە وا وەصفی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات (لولاك لولاك لما خلقت افلاك) گـەر هەموو عالەمو ئادەم کۆبێتەوە ناتوانێت ئەو وەصفە جوانەی خودا بکات:

وا کە مەولا وەصفی تۆی کردووە بە (لولا) روحەکەم
عالەمو ئادەم چ یارای ثەنا خوانی تـــــــــــوە

خودای گەورە ئەرواحی ئادەمی کۆکردەوە پـەیمانی لێ وەرگـرتن فـەرمووی (الـست بربکم) ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیـان (قـالوا بلـی) اعـراف ١٧٢، بەمـەش سـەلماندنی هەبوونی تۆیە، هەبوونی تۆش قبوڵ کرا جا چ بە نعم بێت یاخود (بلی):

(اثبات)ی وجوودی تووە ئەرواحی فەریقیـــــن
تەصدیقی (الست) چ (نعم) بێ چ (بلی) بـــێ

هەمدیسان لەسەر (قالوا بلی) شاعیر دەڵێت نهێنی (الست بربکم) شتێکی پەنهانـە لەعالەمی عیرفاندا، تۆش چ کارت بەوە هەیەو خۆت شـێت دێوانـە مەکـە تـصدیقی ئەو (الست بربکم) بکە بە وشەی (قالوا بلی):

ئەم سیڕرە پەنهانە بۆ عالەمی عیرفانـــە
تۆ خۆ مەکە دێوانە هەر (قالوا بلی)یێکە

حەزرەتی یوسف چەند ساڵ کەوتە بەندیخانە بەدەستی عەزیزی میـسرەوە، حـەزرەتی یەعقوبی باوکیشی گەلێك دڵتەنگو غەمگین بوو، چاوەکانی کـوێر بـوو لـەتاو دووری یوسفی کوڕی، جا صافی دەڵێت منیش وەکو یوسف کەوتومەتـە زینـدانی عـەزیزێك، بەڵام بۆ دڵئارامی خۆم تەماشای یەعقوب دەکەم دڵی خۆمی پێدەدەمەوە:

وەکو یوسف لە زیندانی غەما حەبسی عەزیزێکـــــم
لەبۆ (تسکین)ی جارێ روو لەلای کەنعان نەکەم چبکەم

لای صافی دڵ بولبولە گەر بێتو لەدەورو خولیا شیوەنو زار نەکا چبکا:

دڵی بولبول لە دەوری باغی گەل یاری نەکا چبکا
لەتاوی غونچە هەر دەم شیوەنو زار نەکا چبـــکا

لای صافی رۆژگار لەزەتی تیا نەماوە، ئێستا هەمووی بۆتە زیللەت، بۆیە وا چـاکە یاران دەست لە دنیا هەڵبگرن دڵداری راستەقینە بکـەین دیـارە دڵـداریش لای صـافی خۆشەویستی خواو پێغەمبەرە(ﷺ):

زەمان لەززەتی رۆییو لەدەوری زیللەتی واهات
ئیتر یاران لەمەولا روو لە دڵداری نەکا چبـــکا

شاعیر دەڵێت لەئاهی گەرمم ئێستاکە لێوم وشك هەڵاتووە لە سەرچاوەی چاوەکانیشم خوێن فرمێسکی بە بەردەوامی لێ نەیەتە خوارەوە چبکا؟

کەواتە لە دووری خۆشەویستەکەی هەم لێوی وشك بووە بەو ئاهە گەرمە کە هەناسەیە دێتە دەرەوە، چاوەکانیشی بۆ ئەوەی بێتە تەواوکەری خوێنو ئاوی لێئەتکێ:

لە ئاهی گەرمەوە وا لێو بەبارو خشکە ئێستە
لە عەینی چاوەکانی خوێنو ئاو جاری نەکا چبکا

صافی بە درێژایی شەو چاوی ناچێتە خەو لەتاو دووری یارەکەی خوا خوایەتی ڕۆژی لێ هەڵبێ بۆ ئەوەی بە دبداری دلدارەکەی بکات، ئەگەر صافی بە ڕۆژ بێدارو هۆشیار نەبێت بۆ گەیشتنی دڵدارەکەی چبکا:

شەوی هیجران خەیاڵی یار دەکا ئەسلا خەوی نایێ
بەیادی ڕۆژی وەصلی حەز لە بیداری نەکا چبکا

صافی ڕووی دڵدارەکەی بە نوری ئیمانو خواپەرستی دەشوبهێنێ ئەوکاتەی کە زوڵفی لەسەر ڕوومەتی لادەدات بۆیە وەکو شێخی صەفان مەیلی ئەوە دەکات خۆی بەرەو ڕووی یار بسوڕێنێ ، چونکە ڕوناکی هەردەم لە ڕووی یارەکەم هەردەم دەدرەوشێتەوە(٤):

بە کوفری زوڵفی ئیسلامی بەستوە بۆیە دڵ ئیستێ
وەکو صەنعانی دائیم مەیلی زیبناری نەکا چبکا

خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ) (البقرة- ١٠٢)، وشەی ملکین بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە یەکەم بە فەتحەی لام یانی دوو فریشتە ئەم بارە متەواترەو جێگای شوبهە نیە.

دووەم باریان ملکین بە کەسرەی لام یـانی دوو پاشا ئـەم بـارە لەخوێندنـەوەی ابـن عباس، حسن، ابوالاسود، ضحاك، وەرگیراوە زانایـانی تەفـسیر فەرموویانـە ئـەگونجێ فریشتە بووبن، بەڵام لەبەر ئەوە زۆر بەسەر دڵی ئادەمیزادا بەحورمەت‌و خـاوەن شـان بوون وەکو دوو پاشا تەماشا کراون وە ئەگونجێ دوو پاشا بوون بـەڵام لەبـەر ئـەوە زۆر ڕەوشتیان بەرز بووە بە فریشتە ناوبراون، ئێمە لەسە باری یەکەمیان دڵمان دامـەزراوە، چونکە خوێندنەوەکە موتەواترەو پێویستی بـە تـەئویل نیـە، وە نـازل کردنـی سـیحر لەسەر ئەو دوو فریشتەیە مەعنای ئەوە نیە کە مەقامی ریسالەت‌و پێغەمبەرا بەشیان بووە، چونکی بە قەطعی پێغەمبەر ئەبێ لە ئادەمیزاد بـێ بـەڵکو مـەعنای ئیلـهام‌و حاڵی کردنیانە لەفەنی سیحر جادوگەری.

وە هۆی ناردنی ئە فریشتانەش ئەوە بوو لەو چەرخەدا ئەوەندە جادوگەری بـاو بـووە خەڵك گومڕا بوون‌و باوەڕیـان وا بـووە کـە ریـسالەت‌و پێغەمبەرایـەتیش هـەر فـەنی جادوگەرییە؟! خودای تەعالا ئەو فریـشتانەی نـاردووە وە فـەنی سـیحریان بـە خـەڵك پیشان داوە بۆ ئەوە بزانن کە نوبـووەت‌و ریـسالەتی پێغەمبەرایـەتی بـارەی بـەخش‌و فەیزی خودایە پەیوەندی بە خوێندنەوە نیە، بەڵام جادووگەری فەنە هەرکەسێ بیخوێنێ ئەیزانێ دوورە لە فیوضاتی ئیلاهیەوە هەرکەس بـاوەڕی وانـەبێ ئـەوە گومڕایـەو بـە هەڵەدا چووە.

وە ئەو شتانەی کە مەشهورن لەناودا لە بابـەتی ئـەم دوو فریـشتەوە کـە گـیرۆدەی گوناهو تاوان بوون وە خودای تـەعالا خـاترخۆی کـردن لـە مابـەینی عـەزابی دنیـاو عـەزابی قیامـەتا، وە ئـەوانیش عـەزابی دنیایـان ئیختیـار کـردووەو ئەوانـە ئێـستا لەچاڵێکدا هەڵواسراون لە (بابل) دا، وەتـا قیامـەت بـەو جۆرە ئەمێننـەوە، لەسـەر فەرموودەی زانایـانی تەفـسیر ئەساسـیان نیـە وە لـە ئەحادیـسی صـەحیحدا نیـە وە موخالیفی نەصی قورئانە، چونکە خودا لەباس فریشتەدا ئەفەرموێت: (لاَ يَعْصُونَ اللَّـهَ

مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ) وە تەفسیری بیضاوی ڕەدی ئەم شتانە ئەکاتەوە هـەروا تەفسیری فەخری ڕازیش بەم قسانە ڕازی نیە [٥].

صافی شاعیر ئەم بەسەرهاتەی هاروت‌و ماروتی بەم شێوە خستۆتە قالبی شیعریەوە کە هارووت‌و مارووت بەهۆی سیحریانەوە ریسواییان لێوە دیارە:

سیحری دڵی مارووتە کە شەیدایی عوزارە
فیکری دڵی هارووتە لە ریسوای دیـــــارە

## سەرچاوەکان‌و پەڕاوێز:


١- دیوانی بیرەوەری ٣١ ساڵەی کۆچی دوایی صافی/ مدحت بیخەو لێکۆڵینەوەی سـاغکردنەوەی محمدی مەلا مستەفا هیرانی / کوردستان ٢٠٠٤.
٢- هەمان سەرچاوە.
٣- هەمان سەرچاوە.
٤- نەوزاد کەلهور/ لێکۆڵینەوەی ئـەدەبی بـەراوردکاری نێـوان دوو هـۆنراوەی صـافی‌و مـەحوی، ڕۆژنامەی خەبات ژ ٢٠١٣، ٢٠٠٥/١٢/٢٧.
٥- تەفسیری نامی، بەرگی یەکەم، مەلا عبدالکریمی مدرس.

# حـــــەمـــــدی

حەمدی (١٨٧٨-١٩٣٦) یەکێکە لە شاعیرە بەرزو هەڵکەوتوەکانی کورد.

شاعیر خامەی ڕەنجێکی بێوچان بووە، لە مەیدانی شیعری کلاسیکی کـوردی، جـا شارەزا بوونو ئاشنا بوون لە شیعرەکانی حەمدی کە هـەڵقوڵاوی بـیری سـەردەمەکەی بووە، پێویستی بە ماندووبونێکی زۆر هەیە، چونکە شیعرەکانی هەمـە جۆرو هەمـە لایەنە.

حەمدی شاعیر بە منداڵی بـە گـوێرەی بـارودۆخی سـەردەمەکەی چۆتە حـوجرەی فەقێیانو دەستی کردووە بە خوێندنی زانستە شـەرعیەکانو کەوتۆتـە بـەر کاریگـەری ئاینی ئیسلام، ئەگەر چـی حەمـدی مەلایـەتی نـەکردووە، بـەڵام چـونکە پـەروەردەی حوجرەی مزگەوت بووە شارەزایی باش لە ئاین هەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی دیوانەکـەی پڕیەتی لە شیعری ئـاینی، چـەندین ڕووداوو وشـەی ئـاینی تێهەڵکێـشی شـیعرەکانی کردووە، جگە لەوەش چەندەها شیعری بەسەر پێغەمبەر(ﷺ)و یارەکانی دا هەڵگوتوە.

ئەگەر فەلسەفەی عەقڵانیەت لە ئەوروپا تەئـسیرێکی زۆری کردبێتـە سـەر ڕێـرەوی ئەدەبو دیاری کردنی بابەتو شێوەکانی، ئەوا بیری ئاینی لە ئیسلامدا هـەمان ڕۆڵی بینیوە، ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە زۆر شتی جەوهەریمان دەربارەی ئـەدەبی کلاسـیکی کوردیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، چونکە هەموو شاعیرەکانمان بە شێوە گـشتی مـەلا بـوون یان هەر هیچ نەبێت دەورەکـانی فـەقێتیلن بینیـوە، زانـستەکانی ئـاینی ئیـسلامیان خوێندووە، باوەڕی ئاینی لـە مێـشکیاندا چەسپاوەو ڕەوتـی بیرکردنـەوەیانی دیـاری کردووە.

حەمدی هەروەکو شاعیرە کلاسیکیەکانی تری کورد موسلمان بووە و، موسلمانێکی ڕاستەقینەش بووە، خۆ ئەگەر سەرنجێکی ورد لەو شیعرانەی بدەین کە لەژێر ناوی (تەرجیع بەندی خواناسی) دایناون دەگەینە ئەو ڕاستیە کە حەمدی جۆرە وردکاریەکی ئەوتۆی بەکارهێناوە کە کەم شاعیر هەیە توانیبێتی بەم شێوەیە بە ناخی وردەکاریدا شۆربێتەوە:

بەهەرلادا ئەنواری درێژە بۆ ڕەجا دەستی
یەدی بەیضایی موسایە کە دەربێ بۆ عەطا دەستی
بە ماهی نەخشەبو باڵی هومایی دەوڵەت دانێ
لە هەر لایێ کە یەك ڕووبێ یا بێ‌ڕیا دەستی
لەسەر عەرضی محەببەت گەر حکومەت دابنێ ڕەسمێ
کەسێ شەققول قەمەر ناکا بەرێ بۆ هەر صەبا دەستی

دەستی دەسەڵاتی خوای گەورە هێند درێژو پڕ بەخشنشە، لەهەر کوێیەك بێت ئەتگاتێ کە بەخششت بداتێ، یەدی بەیضا ئاماژە بەو موعجیزەی حەزرەتی موسا دەکات کە خودای گەورە پێی دابوو، هەرکاتێك دەستی لە باخەڵیا دەرهێنابایە سپی دەبوو دەدرەوشایەوە، خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ) (القصص- ٣٢).

هەروەها باس لە موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات کاتێك قورەیشیەکان داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە مانگیان بۆ شەق بکا، لە ڕاستیدا ئەو کارەی کرد هەموو خەڵکی مەکە شەق بوونی مانگیان بەچاوی خۆیان بینی، بە گوێرەی قسەی زانایانی گەردوون ناس کە چونەتە سەرمانگ پاشماوەی ئەو شەق بوونە باس دەکەن.

شەق بوونی مانگ ڕاستیەکە کە مرۆڤی خاوەن باوەڕ ناتوانێ حاشای لێ بکا، چونکە خودای گەورە دەفەرمویێت: (اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ) (القمر- ١).

یەکێك لەو پێغەمبەرە گەورانەی کە بۆ بەنی ئیسرائیل ڕەوانە کراوە (حەزرەتی موسایە) سلاوی خوای لێبێت، کە بە (کەلیم) یش ناسراوە چونکە لەسەر کێوی طور قسەی لەگەڵ خودا کردوە (وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا) (النساء- ١٦٤)، پیاوی خودانەناسی ئەو سەردەم فیرعەون بووە، داوای ئەوەی کردووە کە خوای هەرە گەورەیانە (أَنَا رَبُّكُمْ الأَعْلَى) (النازعات ٢٤)، خودای گەورە حەزرەتی موسای ڕەوانە کردو موعجیزەی دارعەساشی پێدا بۆ ئەوەی بیانهێنێتە سەر ڕێگای ڕاستو خوداپەرستی شاعیریش هەڵساوە لەم دێرە هۆنراوەدا بەرجەستەی کردووە:

چ پەروامە ڕەقیبانت ئەگەر فیرعەونو هامانن

کەلیمە عاشقی پیرت کە نایەسەر عەسا دەستی

حەمدی لە قەسیدەیەکدا لە مەدحی پێغەمبەردا(ﷺ) باسی گەورەیی ئەو موعجیزەیە دەکات، کە خودای گەورە دەعوەتی پێغەمبەری ﷺ کرد بۆ ئاسمانەکان ئەو ئیسرا معراجەی پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی لە طائف گەڕایەوە، کاتێك گەڕایەوە مەکە خودای گەورە شەوڕەوی پێکرد لەگەڵ جیبرائیل کە سواری (بوراق) بوو، خێرایی ئەم بوراقە هەریەك هەنگاوی بەقەدەر ماوەی بینینی چاو بووە، شاعیر هەولی داوە کە زۆر سەرکەوتوانە ئەم موعجیزەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بخاتە قالبی شیعرێکی خۆیو دەڵێ:

وەك گەردی بوراقت شەوی میعراجت بەجێما

جبرائیل ئەمین نەیبوو ئیتر قووەتی شەهبەر

حەمدی وەکو مرۆڤێکی باوەڕ بتەو بە پاداشو سزای ڕۆژی دوایی دەڵێت ئاگری دۆزەخ سزای ئەو کەسانەیە کە باوەڕ بە تاکو تەنیایی خودا ناکەن، بەڵکو ئینکاری ئەو ڕاستیە دەکەن کە خودایە ئەوا دۆزەخ جێگایان دەبێت، بەڵام ئەو کەسەی شوێن هەڵگری ئەو ئاینە بێت ئەوا لەسەرچاوەی ئاوی کەوثەرو باغومێرگی بەهەشت پاداشتی

دەدرێتەوە، دیارە باسی ئاگری دۆزەخ‌و بەهەشت لەزۆر جێگای قورئاندا باسکراوە، هەروەها ئاوی کەوثەر کە خەلاتێکە بۆ دڵ دانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) خودای گەورە پێی بەخشیووە کە خودای گەورە دەفەرموێت: (انا اعطيناك الكوثر) شاعیریش دەڵێت:

دەریایەکی ئاگر ئەوە بۆ مونکیـــری
بۆ (من تبعث) باغی بەهەشت چەشمەی کەوثەر

پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی (٦)ی کۆچیدا دەستی کرد بە بانگکردنی خەڵکی بۆ ئاینی ئیسلام لە دەرەوەی دورگەی عەرەب نامەیەکی بۆ کیسرا نارد، هەڵگری نامەکە (عبدالله کوری حذافه) بوو، داوای ئیسلام بوونی لە کیسرا کرد، کاتێك پاشای فارسەکان نامەکەی خوێندەوە زۆر توڕەبوو نامەکەی دڕاند، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی بیست فەرمووی (مزق الله ملكه) شاعیریش ئەم بەسەرهاتەی وا دەربڕیووە:

خەسرەو کە سەری دابوو لەبەرد بەردی لەسەردا
کیسرا دڵی هەردوو شەق‌و پەق بوو بە خەنجەر

شاعیر دەڵێت لەم بەیتەدا:

فەرمووتە کە حامی‌و کەسایەتی سەری ئێوەم
ئەو وەختە کە ناپرسێ برا حاڵی برادەر

(ليلة القدر) ئەو شەوە پیرۆزو پڕبەرەکەتەیە کە خودای گەورە بە ئومەتی پێغەمبەری(ﷺ) بەخشیوە، لەبەر تەمەن کورتی ئومەتەکەی، دەکەوێتە دەشەوی کۆتایی مانگی رەمەزانی پیرۆز، زانایانی ئاینی بیروڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەم شەوە، بەڵام زۆربەی ڕاکان ئەوەیە کە (٢٧) رەمەزانە، خێری زیندوکردنەوەی ئەو شەوە بەقەدەر (١٠٠٠) مانگە، بە نەصی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێت: (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ) (القدر- ٥)، حەمدی شاعیر لە گەورەیی ئەوشەوە دەڵێت:

هەر شەوی میعراجە تەنیا کائیناتە قیمەتی
(ليلة القدر)ی موقابیل صەدهەزار رۆژانە شەو

قارون یەکێکە لە کەسە هەرە نزیکەکانی موسا پێغەمبـەر مرۆڤێکـی هـەژار بـوو، پاشان دەوڵەمەند بوو بـە پیـشەی زێرینگـەری کلیلـی خەزنـەکانی چـەند کەسـانێکی بەهێزهەڵیان دەگرت، لە دوایدا خەڵکی داوایان لێ کرد لە ڕێگای خودا سەرفی بکات، چونکە خودا چاکەی لەگەڵدا کردووەو دەوڵەمەندی کردووە، کەچی قارون دەیگـوت لـە ئەنجامی زانستو زانیاری خۆم پەیدام کردووە، لە ئـەنجامی ئـەو سەرپێـچیەی قـارون، خودای گەورە بەناخی زەویدا بردیە خوار (خَسَفْنَا بِهِ الأَرْضَ)، حەمـدی شـاعیریش بـەم شێوەیە ئەم بەسەرهاتە دەڵێت:

بە نەقدو جنسەوە قاروون صیفەت بڕواتو هەر گوم بێت
وە یاخود هەر بسوتێ تا دەبێتە گەردی خاکســـــــتەر

موسا پێغەمبەر قسەی لەگەڵ خودا کرد کە خۆی پیـشان بـدات، خـودای گـەورەش لەوەڵامدا فەرمووی تۆ یەکێکی لە مەخلوقاتی من، توانای دیتنی منـت نیـە، بـەڵام تەماشای ئەم کێوە بکە (کێوی طـور) کە پرتەوی زاتی خۆمی بۆ دەنوێنم، جا کە نوری خودا دای لەکێوی طور کردی بە مادەیەکی هاردراو ورد وەکو سورمەی چاو، لە حـاڵی بوونی ئەو وەزعە بە هەیبەتە حەزرەتی موسا بێهۆش کەوت:

ئەو سوئالەی نەکردبوو موســـــــا
وەختە بوو بۆ خۆی ببێتە سورمەی طور

مێژوونوسو موفەسیرەکان گەیشتونەتە راستیەك، کاتێك لافاوەکەی حـەزرەتی نـوح هەڵسا، پاشان کەشتیەکەی نوح پێغەمبەر(ﷺ) لەسـەر کێـوی جـودی گیرسـاوە، ئـەم جودیە هەندێك لەو باوەڕەدان لە نزیك مەلاتیـەی کوردسـتانی بـاکورە، هەنـدێکی تـر دەڵێن جزیرەی (ابن عمر)ـە لە موسڵی ئێـستایە، هەرچۆنێك بێـت لـەوڵاتی کـوردان گیرساوەتەوە (واستوت علی الجودی) وەکو خودای گەورە دەفـەرموێت، حەمـدیش ئـەم بەسەرهاتە وا دەردەبڕێت:

وا لەسەر کێوی جودی حەضرەتی نوح
ئەم کەلامە دەڵێن لەگەڵ ئاشـــــوور

لە زانستی کەلامـدا زۆرجـاران وشـەی ئـەزەلو ئەبـەد بـە یەکـەوە دێـت، زۆر لـە خوێنەرانیش وا هەست دەکەن کە جیاوازی ئەوتۆ لە نێونیاندا نیە، بەڵام وشـەی ئـەزەل بە گوێرەی زانایانی زانستی کەلام بەمانای ئـەوە دێـت کـە شـتێك سـەرەتای نـەبێت (لابدایە لە) هەر شتێکیش سەرەتای نەبێت کۆتایشی نیە وەکو خودا شتێکی ئەزەلیە، واتە سەرەتاو کۆتایی نیە بە گوێرەی فەلسەفەی ئایدیای هەروەها سروشت ئەزەلـە لای مادیەکان، بەڵام ئەبەدی بەو شتە دەڵێن کە سەرەتای هـەبێتو کۆتـایی نـەبێت وەکـو مرۆڤـ لەکاتێکی دیاری کراو دروست کراوە، بەڵام کۆتایی نیە گیانەکەی هـەردەمێنێت لە جیهانی بەرز (خَلَقَ الإنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ) (النحـل- ٤)، شـاعیر پیاوێکی خاوەن باوەڕ بووە بەخوداو جیهانی بەرزەخ هەورووەها بڕواش بە ئەزەلی خـودا هەبووە کە خاوەنی هەردوو جیهانە:

لە ئـــەزەل تا ئەبەد خوا خوایە
جیلوەیەکـە کە پڕ بە دوو دنیایە

لەو خودایە ئەزەلیەی کە حەمدی بڕوای تەواوی پێ هەیە جێگای گومان نیە خـاوەن قودرەتی بێهاوتایە نەماننناسیە وەکو ئـەوەی شـایانی ناسـینە، هـەروەها بەندایـەتی ناکەین وەکو ئەوەی شایانی بەندایەتی بۆ بکەین.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (ما عبدنا حق عبادتك، مـا عرفنـاك حـق معرفتـك) حەمدی شاعیر وەکو مرۆڤێکی شارەزا لە ئایین ئەو فەرمودەیەی کردۆتە نیوە بەیتێکی خوداناس کە دەڵێت:

یا ئیلاهی بەقەدەری تۆ بێ شـــك
ما عرفنـــــــك حق معرفتـــك

خودای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبـێ موعجیزەیەکیـشی داوەتـێ بـە گـوێرەی سەردەمەکە، ئەوە عیسا پێغەمبەر مردووی زیندوو دەکردەوە کوێرو بەلەکی چـاك

دەکردەوە، هەروەها موسا پێغەمبەر موعجیزەی دارعەسای پێبەخشی:

ئیعجازی دەمو دەستی مەسیحاو کەلیمی

هەردوو دەمو دەست کەوتە بازووی محمـــد

بۆ رزگاربوون لەدەستی فیرعەون، موسا پێغەمبەر ئیشارەتی کرد بە رووباری نیل بوو بە دوو بەشەوە، موساو لایەنگیرانی پەڕینەوەو رزگاریان بوو، پاشان فیرعەون لایەنگیرانە بە هەمان شێوە ویستیان لە نیل بپەڕینەوە، بەڵام ئاوەکە بەیەك گەیشتەوە فیرعەونو کۆمەڵەکەی خنکان بوونە عیبرەت بۆ دنیا (فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ، وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الآخَرِينَ، وَأَنْجَيْنَا مُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَجْمَعِينَ) (الشعراء: ٦٤-٦٥)، کەچی بە پێچەوانەوە پێغەمبەر(ﷺ) کە لەشکری ئاویان لێبڕا، لەنێو پەنجەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاو زیادی دەکرد، تاکو سوپای ئیسلام تێرئاو بو پێویستی خۆیان جێبەجێ کرد ئەوا شاعیر دەڵێت:

ئەو پەنجەیە دەریای وشك کرد بە ئیشارەت

بۆ تۆشە کەچی جاری بووە جۆری محمـــد

خودای گەورە گەر بیەوێت یەکێ گەورە بکاو خەلاتی پێغەمبەری(ﷺ) بداتێ، جیاوازی ناکا چ ئەحمەد بێ چ موسا بێ، چونکە هەرخۆی دەزانێ ئەم خەڵاتە بەکێ ڕەوا دەبینێ جیاوازیش ناکا لەنێوانو شوێنانو شوێنێکی تردا (الله يعلم حيث يجعل رسالته) شاعیر دەڵێت:

خوا رۆژی لە هەرکەس کردەوە یەك شەو کیفایەتیە

چ ئەحمەد بێ چ موسا بێ چ عیسا بێ چ سینا بێ

یەهودیەکانی سەردەمی عیسا پێغەمبەر داوای ئیعجازیان لە عیسا پێغەمبەر کردو گوتیان: ئایا خودا دەتوانێ سفرەیەکیان بۆ بنێرێ خواردنیشی لەسەر بێت، پاش هێنانی موعجیزەیەش هەر ئینکاری حەزرەتی عیسایان کرد (إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَاعِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنْ السَّمَاءِ) شاعیریش بەم

شێوەیە دەڵێت:

ئیبنی مەریەم ڕادەکێشێ سفرەی خامی بەهەشت
وەك حەوارییون یەهودی ئیدیعای ئەعجاز ئەکـا

حەزرەتی موسی لە نیشانە گەورەکانی ئەوە بوو دەستی لـە باخـەلیا دەنـا، پاشـان دەری دەهێنا سپی دەبوو دەدرەوشـایەوەو زیانیـشی پێنەدەگەشـت هـەروەکو خـودای گەورە دەفەرمویێت: (وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَـةً أُخْـرَى) (طه- ٢٢).

زولفەکانت قورصی ڕوومەتی وەك قەمەر گرتووە چنگ
بۆ گروهی مونکیری حوسـنت یەدی بەیضـــایە بۆ چ

خودای گەورە لە قورئاندا دەربارەی عەسای دەستی دەفەرمویێت: (قَـالَ هِـيَ عَـصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى) (طه- ١٨).

کەواتە ئەو عەسایەی دەستی موسا بەکارو کەڵکی ئێمە نایەت، ئەوەی بە کەڵکی ئێمە دێتو ئێستا مایەی شانازیمانە ئەو کەوڵو پۆست دارعەساییە کە بەدەستی شێخ مەحمودەوەیە، چونکە ئەو ئێستا جێگای ئومێدو بڕوای هەموو لایەکمانە.

خـەرقەیی شاهو عەسای موسا لەلام بێشەوکەتە
فەخری ئێمە وا بە کەوڵو پۆستو دارمەششاکەوە

حەزرەتی عیسا موعجیزەی ئـەو بـوو کـوێرو بەڵـەكو سـکماکی چاك دەکـردەوە، هەروەها مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خوا (وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ) (ال عمـران- ٤٩)، شـاعیر دەڵێـت: (ئیمـڕۆ ئێمـە هیوامـان بـۆ گەڕایـەوە جارێکی تر ژیانمان بەبەردا کرایەوە، هەروەکو چۆن حەزرەتی عیسا موعجیزەی ئەوەی هەبوو، کەسێك بمردایە جارێکی تر ژیانی بەبەردا ئەکردەوەو زیندووی دەکردەوە):

زەمان ئەمڕۆ حەیاتی وەك مەسیحا کرد بەبەرمانـــا
ئەمەل ئەمڕۆ دەمی پشکوت بە تەسبیحاتی دانەی بەر

شاعیر لە ستایشی حەزرەتی (ئەبوبەکری صدیق) دا دەڵێت قەڵەم هۆشیارو ئاگادار بە باسی کەسێکی گەورە دەکەین ئەویش خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو خەلیفەیە هێندە گەورەو بەرێزە لەلای خوداو پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئیمانی ئەو خەلیفەیە وەکو دەریا وایە بێکۆتاییە، دەریا لە گەورەیدا

سنوری نیەو هێندە قوڵیشە کەس نایگاتێ، جا قەڵەم زۆر وریا بە نەوەك تووشی بێئەدەبیەك ببی بەرامبەر ئەو زاتە:

وریابە قەڵەم باسی ئەبوبەکری صـــدیقە
ئیمانی کە دەریایەکی بێحەددو عەمیقە

ئەمجارە لەباسی (عومەری کوڕی خەتابدا) دەڵێت ئەی خامە وەکو خەنجەر لە کالآنێ وەرە دەرەوە، خۆت سازو ئامادە بکە چونکە باسی مرۆڤێکی گەلێك گەورە دەکەین ئەویش (عومەری کوڕی خەتاب)ـە:

ئەی خامە لەرووتا وەرقت عەینی سوپەر کە
راکێشە ئیتر شیری زوبان باســـی عومەرکە

عومەر ئەوکەسە بوو بە ئاشکرا بووە ئیسلام بێئەوەی ترسی لەهیچ کەسێك هەبێت ئەو ڕۆژەی بووە ئیسلام هەرچی ترس هەبوو لەدڵا موسڵمانان نەما بە ئیسلامبونی عومەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) نازناوی (فاروق)ی پێبەخشی، جا قەڵەم ئەو لاپەرەیە بەقسەی جوانو شایستە پڕبکەوە وەکو گەوهەر برازێنەوە:

بێپەردە بدە بانگـــــی بیلالانە کە عومەر
مەردانە لەسەرمانە لە دڵ دەفعی خەطـەرکە
تەعریفی جەوادی کەفی فاروق ئەکەی تـــۆ
صەفحە لە قسە وەك تەبەقی پڕلەگەوهەر کە

جاری سێیەم باسی عوثمانی کوری عەفان دەکات، ئەو خەلیفەیە خاوەنی شەرمو حەیایەکی گەلێك بەرز بووە، مەلائکەی ئاسمان شەرمیان لە عوسمان کردووە، کەواتە

عوسمان لە شەرمو حەیادا پشکی شێری بەرکەوتووە لەزەمیندا، لە دەریاشدا وەکو ئـەو نەهەنگە وایە کە لە رووباردا جێگای نەبێتەوە پێویستی بە دەریا هەیە، لە دیانـەتیش وەکـو ئـەو ئەسـتێرە پرشـنگدارە وایـە لەئاسمانـدا دەدرەوشـێتەوە، هـەروەها لـە سەخاوەتیشدا بەو هەورە بارانایە دەچێت کـە دەبارێـت بەسـەر زەویـدا، زەوی پـاراو دەکاو عوسمانیش ماڵو سامانی وەکو ئەو بارانە دەبەخشێ:

عوسمان کە نەهەنگێکە لە دەریای حەیادا
کێوێکی بە تەمکینە لە دنیـــای وەفادا
جورمێکی مونیرە لە سـەماواتی دیانەت
هەورێکی مەطیرە کە لە ئافـاقی عەطادا

عەلی کوری ئەبی طالب خەلیفەی چوارەم قەڵای خەیبەر لەسەر دەسـتی ئـەو فـەتح کرا، ئەو فەتحەش دیارە لە ئەزەلدا بەباڵای عەلیدا بڕاوە، دیـارە ئـەوەش گەورەییـەکی زۆرە بۆ عەلی کوری ئەبی طالب کە ئەو سەرکەوتنە بەدەست بهێنێت:

ئەو وەختە کە شمشێری شەم شیری لەدەم هـــات
ئەی وت کە ظەفەر بۆ عەلی تاسەر بەقەدەم هات
بۆ فەتحی قەڵای خەیبەرو مەیدانی جەبـــەل بوو
وەك ناظری قەصرێکی بەرین روو بە ئیـــرەم هات

حەزرەتی سولەیمان ئەنگوستیلەی لەپەنجـەدا بـوو، بـەهۆی ئـەو ئەنگوستیلەیەوە، هەموو شتێکی بۆ جێبەجێ دەکرا، شاعیر دەڵێت جـا یـەکێك چـۆن دەتوانێـت کێـوی یاقووتو زومرود بەدەست بهێنێت؟ کە ئیشارەیە بۆ چیاکانی کوردسـتان کـە هـەموو یاقووتو زومرودە:

خاتەمی پەنجەی (سولەیمان)ی نەبیّ نەم بیستووە
کێوی یاقووتو زومرود قوببە قوببە سەوزو سور

خوای گەورە ئەرواحی ئادەمی کۆکردەوە فەرمـــــــووی (الست بربکم) الاعراف،

ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیان (قالوا بلی) شاعیریش دەڵێت من نەوەی ڕۆژی ئەلستم پەیمانم داوەو هەر لەسەر پەیمانەکە ئەمێنمەوە:

طەبیعەت بەرزە ظاهیر گەرچی پەستم
نەوەی ئەو شێرەکەی ڕۆژی (الست)م

خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت (لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ...) (النور- ٦١) واتە هەرکەسێك گەر کوێر بێت گلەیی لێ ناکرێت، خودای گەورە لێپرسینەوەی لەسەر ناکات، دیارە حاجی فەرەج لەبەر هەرهۆیەك بێت حەرەجی نیە چونکە عوزری هەیە:

توخوا مەنعی مەکەن هەرچی بکا حاجی فەرەج
چونکە خوا فەرموویەتی (ليس على الاعمى حرج)

تەوبەی نەصوح واتە ئەو تەوبە راستەی کە مرۆڤ دەیکا بەمەرجێك جارێکی تر نەگەرێتەوە سەرکاری خراپی پێشووی. زانایان دەڵێن: چۆن شیر لە گوان هاتەدەرەوە جارێکی تر ناچێتەوە ناو گوانی ئاژەڵەکە، کەسێکیش تەوبەی نەصوحی کەکرد جارێکی تر نابێت بگەرێتەوە سەری (توبوا الى الله توبة نصوحاً) شاعیر دەڵێت شێخ ڕۆژی تەوبەی هەزاری وەکو من دەدات، بەڵام چ تەوبەیەك؟ تەوبەی نەصوح:

شێخی من تەوبەی هەزاری وەك منی دادا بەمن
تۆبەیەکی کرد کە بێتە حاشیەی تۆبەی نەصووح

پردی صیراط ئەو پردەیە کە هەموو مرۆڤێك دەبێت بەسەریدا بپەرێتەوە هەرکەسێکیش بە گوێرەی کردەوەی خۆی، هەیە وەك بروسك بەسەریدا ئەروا، هەشە بە گاگولکێ ...تاد.

حەمدی گەر سەگی بەردەرگای خودابێ، دیارە سەگ گەلێك بەوەفایە بۆ خاوەنەکەی شاعیریش بەوەفایە بۆ خودا، بۆیە هیچ باکی نیە لەشەری مەحشەرو پەرینەوەی لەسەر پردی صیراط:

حەمدی کە سەگی دەرگەهی مەعشوقی خودابێ
باکی چی یە لەو مەعرەکەی مەحشەرو مەعبەر

حەزرەتی موسا داوای دیتنی خودای گەورە کرد، خوداش لە وەلامدا گوتی نـاتوانی من ببینی بەلام تەماشای نورم بکە لەکێوی طور، کاتێك خودای گەورەی پرتەوی نوری خۆیدا لە کێوەکە، کێوەکە سوتاو موسی بێهۆش کەوت: (قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنْ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّـهُ لِلْجَبَـلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا) (الاعراف- ١٤٣).

شاعیریش دەلێت تۆش سینەت دەرخە با پرتەوی جوانیت دەربکەوێو ئاگر بەربێتـە دلّو دەرونم، هەروەکو چۆن کێوی طـور نـەیتوانی خـۆی بگـرێ لەبـەر پرتـەوی جـوانی خودای گەورە، کێوەکە سوتا:

دەرخە سـینە پرتەوی با ئاگـــرێ بەرداتە دلّ

طووری سینا با بسوتێ، دەرکەوێ بەوشەرطە نوور

نەمرودی پاشای شاری ئورفە بتپەرست بوو، ڕۆژێك خەلّکەکـە بـۆ سـەیران دەچـن، حەزرەتی (ئیبراهیم) بە بیانوی نەخۆشی لەگەلّیا ناچێت (فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ) (الـصافات- ٩٨)، کاتێـك خەلّکەکـە دەچـنە دەرەوەی شـار، حـەزرەتی ئیـبراهیم دەچـێتە نێـو پەرستگاکەو هەموو بتەکان دەشکێنێت تەنها یەکێکیان نەبێت، کاتێـك دەگەرێنـەوەو ئەو کارەساتە دەبینن دەلّێن ئەوا ئیبراهیم ئەوکارەی کردووە (قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ) (الانبیـاء- ٦٠)، بۆ سزادانی ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە دەیخەنـە نێـو ئاگرەکە، خوای گەورە فەرمان دەدات کە ئاگرەکە ساردبێتەوە بـە سـەلامەتی رزگـاری بێت (قُلْنَا يَانَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ) (الانبیاء- ٦٩)، شاعیر دەلّێـت کـە حەزرەتی ئیبراهیم نازناوەکەی (خلیل)ــە کـە عەشـقی خودایـەو ئامادەیـە بـسوتێت لەپێناویدا ئەی نەمرود، چونکە چراش لە روناکیەك زیاتری ناوێت:

خەلیلی عەشقە (حەمدی) موستەعیدی سووتنە نەمرود

چرا نەیویستووە ئەمما لەشوعلەی ئەخگـــــەرێ زیاتر

هەروەها لە شوێنێکی تردا هەر دەربارەی (خلیل اللە) کە حـەزرەتی (ئیـبراهیم)ـــە دەڵێت:

(خلیل اللە) ئەڵێن خۆی خســـتە ئاگر
منیش کەوتوومەتە هیجری نیگـــارم

خودای گەورە لە سورەتی (فاتحة) دەفەرموێت (انعمت علیهم) واتـە نیعمـەتی خـۆم پێدان شاعیریش دەڵێت من سەگی گەورەی پێغەمبـەرانم‌و داوای رەحمـەتت لێدەکـەم، چونکە جگە لەتۆ کێ‌هەیە بمپارێزێ لە (مغضوب علیهم)و (الضالین) جـا مـادام وایـە ئەی پێغەمبەری ئاخرزەمان ئەو رۆژەی خەڵکەی کۆدەکرێتەوە بـۆ وەرگرتنـی پـاداش‌و سزا لە رۆژی حەشر لێم غافل نەبی، چونکە من گەلێك رووسـیاهم، تـۆش لـەو ڕۆژەدا شەفاعەتکاری تاوانباری ئومیدم بەرەحمی تۆیە کە رزگارم بکەی.

من لە (انعمت علیهم) با نەبم بێبـــــەش خووا
خۆ سەگی کۆیی (ئەمیرولمورسەلین)م رەحمـــــەتێ
(غیر)ی تۆ کێ‌من لە (مغضوب علیهم) لائـــــەدا
وەك (ولا الضالین) امین هیچ نەبینم ڕەحمـــــەتێ
تو خووا غـافڵ لە (حەمدی) قەتت مەبە ڕۆژی جەزا
ڕووسیاهم، ئەی شەفیعەل موزنبینم ڕەحمـــــەتێ

حەمدی باس لە صیفاتی خـودای گـەورە دەکـات یـەکێك لـە صـیفاتە جوانـەکانی خودای گەورە (سەمیع) کە گوێبیستی هەموو شتێکە وەکو کەوتنە خـوارەوەی گـەلای دارێك لە شەوێکی تاریکدا:

سەمیعێ بێ کە ببێ دەنگی خشبەی مارو مێروولە
لە شەرحی دا کەڕو لاڵم ئەگەر سوبحان‌و لوقمانم

دیسان (علیم) ناوە جوانەکانی خودایە کە ئاگادارە بە هەمووشتێك، بەڵام زانستی حەمدی شاعیر دلۆپێکە لە دەریا، جا ئەو زانستەی خودا لەکوێ ئەمەی من لەکوێ؟

جگە لەوەش ئەو زانستەی کە من هەمە، هەر خودای گەورە پێمی بەخشیوە:

عەلیمێ کوللی شەیئی نوقطەی پەرگاری عیلمی بێ

دڵۆپێکە بەیاناتم ئەگەر خۆی بەحری عیلمـــــــانم

(بەصیر) خودای گەورە بینایە بە هەموو شتێك لەو ڕۆژەی لە دنیا خەلق کراوە تاکو کۆتایی هاتنی دنیا (إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ) (تبارك- ١٩)، کەواتە من نـاتوانم وەصـفی ئەو خودایە بکەم:

بەصیری ڕۆژی ئەووەڵ کردەوەی ئاخرشەوی دیبێ

چلۆن وەصفی دەنوسێ بۆم ئەگەر بینایی چاوانم

حەمدی گەلێك دەترسێت لەوەی خودای گەورە توورە بێـت قـەهری خـۆی برێـژێت، بۆیە شاعیر هەردەم خەریکی شینو گریانە، هەروەکو کەسێکی شێت جلوبـەرگی لەبـەر خۆی دارنیووە، چونکە هەردەم بیری دۆزەخی تۆم لەبەرچـاوە ئـەو دۆزەخـەی (وَقُودُهَـا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ)

لەترسی قەهری تۆ ڕەببی خەریکی شینو گریانم

جگەرخوێننو دڵ غەمگینو شێتو وێت عوریانم

بەدڵما فکری پرشنگی جەحیمی قەهری تۆ دەڕوا

گرێ دەگرم دەڵێ دۆزەخ دەسووتێ هەر بەسوتانم

هێندە گوناهم زۆرە، گوناهەکانم بەقەد کێوێك دەبێت، بەڵام کە تۆ هەردوو صیفاتی (ڕەحمانو ڕەحیمت) هەیە، بۆیە هاتوومەتە بەردەرگای تۆ لێم ببوری چونکە دیسان تـۆ خۆت دەفەرمووی: (لاتقنطوا):

وەکو کێوی گوناه هاتوومەتە بەر بارەگـــــاهی تۆ

کە موحتاجی بەقەد یەك پەڕ کاهی عەفووی غوفرانم

# کـــەمـــالـــی

(عەلی کەمال باپیر) ناسـراو بـە کـەمالی (١٨٨٦-١٩٧٤) یەکێکـە لـە شـاعیرە کلاسیکیەکانی کورد، کە درێژەپێدەری قوتابخانەی شیعری بابان بوو، ئەو قوتابخانەیەی کە (نالی) دامەزرێنەری بوو، بەکۆچی دوایکردنی ئەم شاعیرەمان دوادڵۆپ لە دەریـای شیعری کلاسیکی کوردی وشك بوو.

کەمالی شاعیر هەروەکو منداڵانی سەردەمەکەی خۆی چۆتە حـوجرەی مزگەوتـەکان فێری خوێندەواری بووە، بەڵام کەمالی درێژە بەو ژیانـەی خـۆی نـادات‌و بێتـە مـەلاو مزگەوتێك ئاوەدان بکاتەوە، بەڵکو هەر لـە سـەرەتای تەمـەنی لاویەتیـەوە کـەمالی تێکـەڵ بـە ژیـانی سیاسـی دەبێـت لـەناو بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی میللەتەکـەی، بەتایبەتیش لە سەردەمی شێخ مەحمودی حەفید.

کەمالی جێگای بڕواو متمانەی شێخ مەحمود بووە، لەسەر ڕاسپاردەی شێخ دووجـار چۆتە ((تاران‌و کرماشان)) بۆ دیدەنی کردنی ((ڕەزا شا))و هەندێ بـالیۆزی هەنـدەران لە ئێران‌و گەیاندنی نامە بەناوبانگەکەی ((شـێخ))ی نـەمر بـە کۆمـاری شـورەوی[1].

کەمالی جگە لەکاری سیاسی لەناو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد‌و شیعرنووسـین کـاری ڕۆژنامەنووسیشی کردووە (سـەردەمی شـێخ مـەحمود، پـاش پێکهـاتنی جەمعیـەتی کوردسـتان دەرکردنـی ڕۆژنامـەی ((بـانگی کوردسـتان))، ڕۆژنامـەی ((ڕۆژی کوردستان))یان دەرکردووە کە ئەم ڕۆژنامەیە زمانحاڵی شێخ مەحمود بووە، بـەڵام ئـەم ڕۆژنامەیە هێندە نەژیاوە، هـۆی نەمانیـشی ئـەو تەنگوچەڵەمەیە بـوو کـە تووشـی سلێمانی هات‌و جارێکی تر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە داگیر کراوە[2].

کەمالی ئەگەرچی شاعیرێکی کلاسیکیەو لەسەر ڕێبازی کلاسـیکیش هۆنراوەی

نووسیوە، بەڵام وەکو شاعیرانی پێش کەمالی پێی ناسرابوون وەکو شێوەگرانی وشەکان داخستنی هۆنراوەکانیان، بەڵام کەمالی بەوە جیادەکرێتەوە کە زیاتر روونیو سادەیی (شفافیە) لە هۆنراوەکانی بەدی دەکرێت کە ئەوەش وای کردووە خوێنەر بە ئاسانتر لە هۆنراوەکانی کەمالی بگات لە ئەوانی تر.

نالی شاعیر دامەزرێنەری بزووتنەوەی شیعری بابانە، بۆیە لەراستی دوورناکەوینەوە گەر بڵێین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ناڕاستەوخۆ نالی کاریگەری خۆی هەبووە لەسەر شاعیرانی دوای خۆی، من بەش بەحاڵی خۆم هەر ئەوەندە دەبینم کەمالی شاعیر هەوڵی داوە شوێن پێی نالی هەڵبگرێو لاسایی چامەکەی نالی بکاتەوە کە لە شامەوە بۆ سالمی هاوڕی ناردووە بە چامەی شارەزوور بەناوبانگە:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور[٣]

کەمالی هەوڵی ئەوەی داوە ئەم هۆنراوەی خۆی بگەیەنێتە هاوشانی نالی شاعیر، بەڵام چامەکەی نالی گەلێك بەرەوژوورترە لە هۆنراوەکەی کەمالی[٤]، بەهەرحاڵ لێکۆلەرەوە کاتێك لێکۆڵینەوە لەسەر شاعیرێك دەکات، ناچار دەبێت پەنا بۆ هۆنراوەکانی شاعیر ببات، چونکە هۆنراوەکان یارمەتی دەرێکی باشە بۆ لێکۆڵەرەوە جگە لەوەش کەمالی خۆی دان بەوە دەنێت کە کاریگەری شاعیرانی تری بەسەرەوەیە کە ئەمەش باشترین بەلگەیە لەسەر ئەوەی کەمالی لەشیعر گوتندا پەیرەوی سالمو حەمدی پێوە دیارە:

لە ڕیزی شاعیرانا بۆیە من ئەمڕۆ سەرئەفـــــــرازم
لە شاگردانی بەزمی حەزرەتی (مەحوی) شەکەرڕازم
لەپاش مەحوی هەمیشە پەیڕەوی (سالم) ئەکەم، لاکین
بەدڵ زۆر عاشیقی هەڵبەستی (ناری) نیکتە پەروازم

دیوانی کەمالی ل ٨٩

هەروەها دەڵێ:

پەیڕەوی (حەمدی) ئەکەم دائیم (کەمالی) بۆیە وا
ویردی خاس‌و عامە ئەشعاری تەرەب ئەفزایی من

دیوانی کەمالی ل ٩٣

کاتێکیش کەمالی (زێوەر)ی شاعیر هەڵدەسەنگێنی وا باسی شاعیران دەکات:

زێوەر لە کوردی یا زۆر تەبعی تەڕو ڕەوانە
بێخود لە فارسی دا هوشیارو نوکتـــە زانە
نوری موقەللیدە بێ‌ڕاوکە شــــــیعری نایە
شوکری بەڕاستی ئەیلێم ئوستادی شاعیرانە (٤)

کە من دەڵێم کەمالی دان بەوە دەنێت کاریگەری شـاعیرانی وەکـو (حمـدی‌و سـالم) لەسەرە یاخود بەمانایەکی تر بلێن کەمالی سەرسامە بە شیعری (حمدی‌و سـالم) ئەمـە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە لە نرخ‌و بۆچونەکەی (کەمال عەلی باپیر) کەم بکەمەوە کە دەڵێت: (من پرکێشی ئەکەم‌و ئەڵێم ئەگەر (کەمالی) ئەیەوێ ئـەوە ناگەیـەنن، بـەڵکو بە پێچەوانەوە من ئەوەندەی جێپەنجە ڕەنگدانــەوەی نـالی شـیعر (کـەمالی)دا ئـەبینم ئەوەندە زەبروکارتێکردنی (سالم، مەحوی‌و ناری) لەسەر نیە(٥))، بەڵگەش ئەوەیـە کـە چەند نمونەیەکی هێناوەتەوە.

ئەوەی لەلای ئێمە سەلماندراوە ئەوەیە کەمالی چەندجارێك لـە هۆنراوەکانیـدا بـاس لەو شاعیرانە دەکات کە ئێمە باسمان لێـوەکرد، تـەنها بـۆ جـارێکیش بـاس لـە نـالی ناکات، جگەلە دان پێدانانەکەی خۆی، کەواتە دەبێ ئەوەش بگوترێ‌بۆچونەکەی ئێمـەو هی (کەمال عەلی باپیر)یش لە نرخ‌و بەهای هیچکامێکیان کەم ناکاتـەوە.بـەیـضاوی یەکێکە لە تەفسیرە بەناوبانگەکانی قورئانی پیرۆز کە قازی ناصرالدین دایناوە، جـاران

فەقییەکان دەیان خوێند، کەواتە ئەو خەت‌و ڕیحانـەی سـەر ڕووی یـار هـەر تەفـسیری بیضاوی بتوانێت ئەم ڕوو تەفسیر بکات:

دەوری ڕووی داوە خەتی ڕێحانەی یارم پێم ئەڵێ
حاشیەی بیضـاویە ئایاتی ڕووی تەفسیر ئـەکا ل ٢٨

کوشتنی ئەحمەد موختار بەگی جاف داخ‌و کەسەرێکی گەورە بوو بۆ میللەتی کورد، چونکە بە مردنی ئەحمەد موختار بەگی جاف کورد شاعیرێکی گەورەی لەدەست دا، بە تایبەتی لە دڵ‌و دەرونی کەمالی بۆیە لەلاواندنەوەی ئەحمەد موختاردا بە جەنات عـدن لێکی دەداتەوە کە خۆی سەفەری کردوە بۆ بەهەشت، ئێمەی لە دۆزەخ بەجێ‌هێـشتووە خوای گەورە دەفەرموێت: (سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ۞ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ) (المدثر: ٢٦-٢٧)

تەئریخی وەفاتیم لەخێرەو پرسـی گوتی پێم
جێی عەدنە ئەوو ئێمەیی جێ‌هێشت لە سەقەردا ل ٢٩

کەمالی خەوئەبینێ بە سەرچاوەی ژیان نۆشـی دەکـا، بـەڵام کاتێـك بەخەبـەردێت‌و تەعبیری خەوەکە وادەردەچێت کە ماچی یارە بۆیە لەسـەر ئـەو خەونـە شـوکری خـوا ئەکات:

لە خەودا ئاوی سەرچاوەی ژیانم نۆش ئەکرد ئەمشەو
شوکر سـبەینێ دیم ماچـی دەمی تۆبوو لە تەعبیرا ل ٣٤

کەمالی وەکو مرۆڤێکی باوەر بە قەزاو قەدەر باوەری بەوە هەیە هەموو شتێك لە قەدەرا نوسراوە بڕاوەتەوە، گۆڕینی لە دەسەڵاتی کەسدا نیە:

من‌و جامی شـەراب‌و زاهیدو ئەندێشـەی کەوسەر
بەدەستی کەس نییـە حوکمی قەڵەم وابوو لە تەقدیرا ل ٣٤

یار بە برژانگەکانی خۆی تیربارانم دەکاو، بەمەش خوێنم ئەرژێ‌و شەهید دەبم، دیارە شەهیدیش کە دەکوژرێ‌و خوێنی دەرژێ نوێژو شۆردنی لەسەر نیە بەجلی خوێنینەوە

دەچێتە مەیدانی مەحشەر:

تیرەبارانی کە کردم یـار بە برژانگـــــــی ووتی

ئەم شەهیدی عەشقە بۆ مەحشەر جلی خوێنین ئەبا ل ٤١

مسولمانان لەکاتی حەج و عەمرە دەچـنە شاری مەکـەو زیـارەتی کەعبـە دەکـەن حەوت جار بەدەوری دەسوڕێنەوە، بەڵام یاری کافر هەموو جارێك زولفی خـۆی پیـشان دەدا بۆمن:

بۆ تەوافی کەعبەیی ڕووی چووم بە موشتاقی کەچی

زولفی کافر حسنی وا بۆ من مەحاڵی چین ئەبـــا ل ٤١

هەر عاشقێك گەر بێتوو دانیشتنی بەردەرگاتی دەست بکـەوێت لـە دونیـادا، ئـەوا بەدڵنیاییەوە لە ڕۆژی حەشریشدا کاتێك هەرکەسێك پاداشی کردەوەی خۆی دەدرێتـێ، چونکە عاشق لەدونیادا بەردەرگای تۆی بەرکەوتووە مافی خۆیـەتی لـەکاتی حـساب و لێپرسینەوە داوای بەهەشتی فـیردەوس نـەکات: (إِنَّ الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ) وە هەروەها لەگەڵ ئیرەم (أَلَمْ تَرَى كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ، إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ) (الفجر- ٧).

ئەگەر دەستی کەوێ دانیشتنی بەردەرکەکەت عاشـــق

لە حەشریشدا موحەققەق مەیلی فیردەوس و ئیرەم ناکا

هەر مرۆڤێکی ئاقڵ و دونیادیدە گەر تێبفکرێ و ورد بێتەوە نوری زاتی هەق هەسـت پێدەکا، بەڵام مرۆڤی قەلەندەر ئەوکەسە جیاوازی ناکات لەنێوان بتخانـە کـە جێگـای بەد گومرایە لەگەل حەرەم کە پیرۆزترین شوێنی خواپەرستیە:

لە هەرلا ئەفکری نووری زاتـــی هەق نـمایانـــە

قەلەندەر بۆیە ئەسلا فەرقی بتخانەو حەرەم ناکـا ل ٤٧

مەنسوری کوڕی حوسێنی حەلاج یەکێك بـوو لـە سـوفیەکانی سـەردەمی عباسـی هەرکاتێك جەذبە ئەیگرت دەیگوت (انا الحق) دەڵێن کاتێك کوشـتیان بـە خوێنەکـەی

دەنوسرا (انا الحق) کەمالی شاعیریش دەڵێت منیش وەکو مەنسور هەرکاتێك بمکوژن‌و خوێنم برژێ ئەوا خوێنەکەم دەردی میللەتەکەم دەنوسێتەوە:

هەروەکو مەنسوور انا الحق گۆ بوو گەر بیشمکوژن

خوێنەکەم ئەتکێ بەکوردی دەردی خۆی ئینشا دەکا ل ٥٠

ئەزەلی‌و ئەبەدی دوو زاراوەی فەلسەفین، مانای جیاوازیان هەیە ئەزەل واتە سەرەتای نەبێت، هەرشتێکیش سەرەتای نەبێت کۆتایشی نیە، بەڵام ئەبەدی سەرەتای هەیە کەواتە دەبێت کۆتایشی هەبێت، کەواتە کەمالی گوناهی چیە؟ کاتێك لە ئەزەلەوە لەچارەی نوسرابێ کە دەبێت ببێتە دیل‌و یەخسیری کەمەندو پەرچەمی یار:

من ئەبێ سووچم چبێ ڕۆژی ئەزەل سوڵتانی عەشق

دیل‌و یەخسیری کەمەندی پەرچەمی تاتام ئەکا ل ٥١

دنیا تەمەنێکی دووردرێژی هەیە لای شاعیران بە پیرەژن ناودەبرێت بۆیە ئەو پیرەژنە داوا لە کەمالی دەکات کە بیخوازێ، واتە بەدوای هەواو نەفسی دونیا بکەوێت، بەڵام ئەو دنیایە وەکو ئەو پیرەژنە وایە کە مرۆڤی ئاقڵ بیخوازێت هیچ لەزەتێکی لێ ناکات، کەمالی ئامادەنیە بەدوای ئەو پیرەژنە بکەوێت، واتە دنیای بەلاوە دەست بەرداری دنیا بوە، چونکە خۆشی‌و لەزەتی دنیا گەلێك کەمەو کۆتایی دێت (قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنْ اتَّقَى وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيلاً) (النساء- ٧٧)

تکای لێم کرد ووتی بمخوازە دنیا زوو جەوابم دا

ووتم ئینسانی عاقڵ مەیلی وەسڵی پیرەژن ناکا ل ٥١

هەرلەم بارەیەوە مەحوی دەڵێت:

تا لەماڵی دەرنەکردووی ئەم شەوی صەد شووکەرە

مەحوی ئازانە بدە تۆ سێبەسێ دنیا طـەلاق

دیوانی مەحوی ل ١٨٠

سەفەری ڕۆژی قیامەت گەلێك دوورو درێژەو کۆتایی نایەت، جا مرۆڤی ئاقل گەربیەوێت بچێتە سەفەرێکی ئەوها دوورو درێژ دەبێت تێشوی ئەو سەفەرەی پێی بێت، دیارە زادو زەخیرەی ئەم سەفەرەش کردەوەی چاکە، چونکە ئەو ڕۆژە تەنها کردەوەی چاك بەهانای خاوەنەکەی دێت پێغەمبەر(ﷺ) لەم بارەیەوە ئامۆژگاری ئەبوزەری غەفاری دەکاو دەفەرموێت: (أعد السفينة فان البحر عميق فاستكثر الزاد فان السفر طويل)، کەمالی شاغیریش لەم بارەیەوە دەڵێت:

ڕێی قیامەت دوورو بێپایانە تویشووی لازمە

پیاوی عاقڵ بۆیە مەیلی جەمعی تویشوو زاد ئەکا      ل ٥٢

سامیری یەکێك بوو لە لایەنگیرانی حەزرەتی موسا، پاشان کە موسی (سلاوی خوای لێ بێ) چوو بۆ خەلوە سامیری دەستی کرد بە جادووگەری، بە زێڕو زیوی (قبطی)یەکان گوێرەکەیەکی لێ دروست کردووە جارجارە بۆڕەی کردووە، بەمەش کۆمەڵە کەسێك بڕوایان پێهێنا، کاتێك موسا گەڕایەوە ناو قەومەکەی لێیانی پرسی بۆچی باوەڕتان پێکرد؟ ئەوانیش گوتیان ئێمە سەرپێچی کردنمان لە بەڵێنەکانی تۆ بەئارەزووی خۆمان نەبوو، بەڵکو سامیری لەزێڕوزیوی ئەم گوێرەکەی دروستکردو ئێمەش باوەڕمان پێهێنا. (أَلْقَى السَّامِرِيُّ ۞ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلاً جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى فَنَسِيَ) (طه: ٨٧-٨٨)

بە بارێ عیلمی حەفتا ساڵەوە دابووم بە شاگردت

بژی ئەی سامیری سەرسامی دیدەی پڕ لە ئەفسوونت      ل ٥٨

کەمالی لەسایەی هونەرەکەی، خۆی بە دەوڵەمەند دەزانێ چونکە هونەر رزقێکی زۆرە ئەو رزقەش لەخواوە بۆ پیاو دێت، بەڵام نابێت ئەو هونەرمەندە ناشکور بێت بڵێت خوای گەورە ڕزقی کەم کردم (فَأَمَّا الإنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ) (الفجر- ١٦)،

هونەر ڕزقێکی زۆرو نیعمەتێکی گەورەیە بۆ پیاو

هونەرمەند ناشکورە گەر بێت بڵێت خوا ڕزقمی کەم کرد      ل ٥٩

کەمالی بڕواو قەناعەتی بەوە هەیە کە نـەوەی مرۆڤــ هــەموو لەپـشتی حـەزرەتی ئادەمەوە پەیـدا بوینـە (کلکـم مـن ادم و ادم مـن تـراب) جـا کـە لـە نـەوەی ئـادەم مرۆڤێکـی وەکو تۆ لێی پەیدا بێت، ئەوا دەبێت سەجدەی شـوکر بـۆ حـەزرەتی ئـادەم ببــەم (وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِـنْ الْجِـنِّ فَفَسَقَ عَـنْ أَمْرِ رَبِّهِ) (الكهف- ٥٠).

که دیم ئادەم نەوەی وەك تۆ لەپشتی دێتە دنیــاوە
سوجوودی ئادەمم برد رەجمی شەیتانی لەعینم کرد ل ٦٢

ئاوی کەوثەر خوای گەورە داویــەتی بـە ئومــەتی محمـد(ﷺ) کاتێــك قورەیـشیەکان گاڵتەیان بە پێغەمبەر(ﷺ) دەکردو پێیان دەگوت وەجاغ کوێر، جا خـوای گـەورە ئـەو حەوزی کەوثەرەی پێبەخشی کە ئەم ئـاه سـپیە وەکـو شـیر، شـیرینە وەك هــەنگوین، کەمالیش لە خەوا جامێك لە ئاوی کەوثـەری خواردۆتــەوە، کاتێــك بـەیانیش لەخـەو هەڵساوە لێکدانەوەی خەونەکەی ماچی دەمی یار کردووە (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ، فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ، إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ) (الكوثر: ١-٣).

لەخەوما جامێ ئاوی کەوسەری دامێ پەری ڕوویــێ
سبەی زوو هاتەدی شوکری خوا ماچی دەمی تۆم کرد ل ٦٣

شێخی سەنعان دەڵێن شێخێکی خاوەن تەریقەت بووەو چـەندەها موریـدی هــەبووە، پاشان دڵی دەچێتە کچە مەسیحیەك، لەدین وەردەگەڕێ دەچێتەسەر ئـاینی عیـسایی، کەمالیش بەدەردی شێخی سەنعان چووە کاتێك کچە مەسیحی دەبینێ عەقڵی نامێنێ واز لە ئاینی خۆی دەهێنێ دەچێتە سەر ئاینو مەزهەبی تەرسا:

که دیم زوننـاری زوڵفو پەرچەمی وەك شێخەکەی (سەنعان)
قوبووڵی مەزهەبی تەرساو تەرکی عەقــڵو دینـم کـــرد ل ٦٢

کەمالی وەکو مرۆڤێکی خاوەن ئەزموون، هەرگیز بڕوای بەپیاوی زاڵم نیە کاتێــك

دەستیان پێ لەکار کێشانەوە ببنە باشترین پیاو هەروەکو شبلیو بایەزیدی بەسطامی، بەلام هەرکاتێك فرسەتیان وەرگرتو گەڕانەوە سەرکار ئەوا دیسان دەبنەوە پیاوەکەی جارانو دەست بەزوڵم دەکەنەوە هەروەکو شەمری سەرلەشکری یەزیدی کوری معاویە کە چەند زوڵمی گەورەیان کرد کە خوێن ڕشتنی حەزرەتی حوسین بوو، کورد ئەڵێ مار ئەمانی نیە تاکو سەری پان نەکەیەوە:

زاڵمان کاتێ کە عەزڵ کران
ئەبن بە شێخی شبلیو بایەزید
دووبارە ئەگەر بچنەوە سەرکار
زوڵم ئەکەن ئەبن بە شەمرو یەزید — ل ٦٥

شێخی سەنعان پێچەوانەی ئەمری غەوثی گەیلانی کرد، غەوث کە نەوەی پێغەمبەرە(ﷺ) لەسەر ڕێگای ئەو ڕۆیشتوە، چونکە ئەمر غەوث هەروەکو ئەمری پێغەمبەر(ﷺ) هەتا قیامەت دەوام دەکا.

سەنعان خیلافی ئەمری ئەوی کرد بوو بە گەور
ئەمری هەتاکوو ڕۆژی قیامەت ڕەوایە غەوث — ل ٦٧

لەڕۆژی حەشردا هەموو کەس کۆدەکرێنەوە هەق لێپێچینەوەیان لەگەل دەکرێت هەرکەس هەقی خۆی وەردەگرێت (هَـذَا يَـوْمُ الْفَـصْلِ جَمَعْنَـاكُمْ وَالأَوَّلِـينَ) (المرسلات- ٣٨)، کەسیش ناتوانێت حاشا بکات لە هیچ کردەوەی خۆی، کەمالیش دەلێت هیچ حاشا مەکە تۆ کوشتەی منیو خوێنی منت ڕژاندوە بەوەش دیارە کە سەرپەنجەکانت بە خوێنی جگەری من سورە:

مەکە حاشا لە خوێنم ڕۆژی مەحشەر قاتلم هەرتۆیت
بە خوێنی جەرگی من سەرپەنجەکەت ڕەنگینە ئەیزانم — ل ٧٥

باخچەی بەهەشت (جنة المأوى) شوێنێکە لە بەهەشت کە موسلمانان خۆزگەی بۆ دەخوازن کە خوا روحمیان پێبکات بیان باتە ئەو شوێنە (أَمَّـا الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُـمْ جَنَّـاتُ الْمَـأْوَى نُـزُلاً بِمَـا كَـانُوا يَعْمَلُـونَ) (السجدة- ١٩)، کەمالی

ئامادە نیە بەتەنها بەبێ یارەکەی بچێتە ئەو شوێنە، بەبێ نیگای ئـەو ئامـادەش نیـە خەیالی بادەو سەبا بکات:

بێویسالّت کە تەمەننای جەننەتولمەئوا ئەکـــەم

بێ نیگاهت چۆن خەیالّی بادەوو سـەهبا ئەکەم ل ٧٩

کەمالی هێندە گیرۆدەی یارەکەیەتی، بەهیچ شێوەیەك نایەوێت بۆ کـەمێکیش لێـی جیابێتەوە، هەرکاتێکیش لەگەلّیدا بێت بەهیچ شێوەیەك بیر لە حووری عین ناکاتــەوە، کە ئەو حۆریە چاوگەش‌و چاورەشانە بۆ مرۆڤی خواپەرست ئامـادەکراون لـە بەهەشـت (وَحُورٌ عِينٌ، كَأَمْثَـالِ اللُّؤْلُـؤِ الْمَكْنُـونِ) (الواقعـة- ٢٢) هـەروەها گـەر ببێتـە گـەداو خزمەتکاری بەردەرکی یار مەیلی فیردەوسی بەرین ناکا (جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً، خَالِـدِينَ فِيهَا) (الكهف- ١٠٧).

کە وەسلّت دەست بدا بۆم هیچ خەیالّی حووری عین ناکەم

گــەدای بەردەرکی تۆ بم مەیلی فیردەوسـی بەریـــن ناکەم ل ٨١

شاعیر هەموو هۆش‌و بیری لای پێنجوێنە چونکە یاری خۆی تێدایە، بـەهۆی بـوونی یارەکەی هەموو پێنجوێنی لەلا جوانە نایگۆڕێتەوە بەشاری سولێمانی خـۆی لەوشـارە بە کۆیلە دەزانێ بۆیە گەر سولێمانی ببێتە بەهەشت‌و دیارە بەهەشتیش پڕە لە حـۆری (إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ۞ فِـي جَنَّـاتٍ وَعُيُـونٍ ۞ يَلْبَـسُونَ مِـنْ سُـنْدُسٍ وَإِسْـتَبْرَقٍ مُتَقَابِلِينَ ۞ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ) (الدخان: ٥١-٥٤).

گەر سلێمانی ببێتە جەننـــەت‌و پڕ بێ لە حــــــوور

پەشمە لام هەرمەیلی وەسلّی یارەکەی پێنجوێن ئەکەم ل ٨٢

ئاوی کـەوسەر، ئـەو ئاوەیـە کـە خـوای گـەورە بـە پێغەمبـەر(ﷺ)و ئومەتەکـەی بەخشیووە مرۆڤی ئیماندار لێی دەخواتەوە، جا هەرکاتێك کەمالی بۆ جارێـك لـە لێـو یار دەمی تەر بکات، ئیتر پێویستی بەوە نیە وەکو ئەسکەندەر کاتێك لەســـــەرە

مەرگیش بوو داوای ئەوەی دەکرد لەئاوی بەقا بخواتەوەو هەتا هەتا نەمرێت:

لە ئاوی کەوسەری لێوو دەمت دەم تەڕ بکەم جـاریٚ
وەك ئەسکەندەر لە مەرگیشا هەوای ئاوی بەقا ناکەم ل ٨٨

کـەمالی گەیـشتۆتە ئـەو قەناعەتـە کـە تـەنها بـە ڕوو لـە خـواکردن مرۆڤـ دەحەسـێتەوە تەنها ڕێگەی خوا ڕێگای سەرفرازیە، ئەگینا ئەوانی تـر هـەموو کـوێرە ڕێگانەو مرۆڤـ توشی چەرمەسەری دەکەن.ئێمە لـە ڕێگـای فیتنـەو تەفرەقـە چـیمان قازانج کردووە، هـەر ڕێگـای خـودا داوای یـەك ریزیمـان لێـدەکا بـۆ ئـەوەی تووشـی پەراکەندەیی‌و سەرلێشێواوی نەبین (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ) (ال عمران- ١٠٣).

خەڵکینە وەرن بەسیە ئیتر ڕوولە خـــودا بن
بەس مایلی فیتنەو شەڕو ئاشووب‌و بـەڵا بن
بەس تەفرەقەو وێڵی کەژو کێوو چیــــا بن
زۆر عەیبە کەم بەم نەوعە پەرێشان‌و گەدا بن ل ٩٢

کاك ئەحمەدی شێخ یەکێك بوو لـە پیـاوە ناودارەکـانی سـەردەمی خـۆی‌و شـێخی تەریقەت بوو، پیاوێکی خواناسانە دوعاو شەفاعەتیان رادەگیری لەلای خـوای گـەورە، بۆیە ئومێدی بەوە هەیە کاك ئەحمەدی شێخ لەلای خوای کردگار، چونکە کاك ئەحـمـەد سەرۆکی ئەولیاکانەو جێگری غەوثـی گەیلانیە، لە هەمانکاتیشدا ئەو پیاوە پشتیوان‌و پەنای کوردانە:

سەگی دەرگانەکەی کاك ئەحمەدی شێخم تەمـــادارم
تکای عەفوم بکە ڕۆژی جەزا شێخم لای کردگاری من
رەئیسی ئەولیایە قوطبە یەعنی واریثـــــی غەوثە
پەناهو پشتیوانی کوردە مایەی ئیفتخـــاری مـن ل ٩٥

حەزرەتی یوسفی کوری یەعقوب، کاتێك لەگەڵ براکانیدا دەچێتە سەیران و فێڵی لێ دەکەن ئەیخەنە ناو بیرەوە هەروەها حەزرەتی (عیسا)ش خوای گەورە بەرزی کردووە بۆ ئاسمانەکان (بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا) (النساء- ٥٨).

چەشنی یوسف تۆ بچۆ ناو بیرەوە ببیە غەریق

یا بچۆرە ئاسمان تەنیا مەسیحایـــــی بکە ل ١٣

یەزیدی کوری معاویە لە ساڵی ٤١ کۆچی لە شوێنی باوکی بووە خەلیفە ئەمەویەکان، بەڵام خەڵکی عێراق رازی نەبوون، داوایان لە حسین کوری عەلی کرد کە بەیعەتی پێ‌ئەکەن ئەو ببێتە خەلیفەی موسلمانان، شەڕو کوشتار ڕویدا، سەرکردەی سوپای یەزید بەسەرکردەی (شمر) بوو، ئالی عەلی هەموو کوشت، بەمەش خوێنی ئەم بنەماڵەیە کەوتە ئەستۆیان، بەڵام کەمالی پێچەوانەی (یەزید) کەمالی خۆی بەسەگو پاسەوانی بەردەرگای پێغەمبەر(ﷺ) ئەولادی پێغەمبەر(ﷺ) دەزانێت:

خۆ یەزید نیم تاکوو ببمە دوژمنی ئالی عـــەلی

شێت نەبووم تابی عەزابی زاتی ئەڵلاهم نییـــە

من سەگی قاپی رسول الله و ئەولادی (عـــەلی)م

بەندەیی زارم خەیاڵی روتبەو جاهم نیـــــە ل ١١٤

خوای گەورە زاتێکی ئەوتۆی لەنەوەی ئادەم بەرەحمەت ڕەوانە کرد بۆ هەرچی گیانلەبەر هەیە لە بونەوەردا، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ) (الانبیاء- ١٠٧)، بۆیە گەر من هەڵنەستم بە مەدحکردنی ئەو زاتە بەرێزە کە هێندە گەورەیە خوا باسی لێوە دەکات، خەڵکی ئێوەش بە پیاوێکی بێباوەڕو کافرو بێدین و ئیمانم تێ‌مەگەن، چونکە من هەرچەندە باس و مەدحی ئەو پێغەمبەرە بکەم، ناتوانم مافی تەواوی خۆی بدەمێ قەڵەم لە ئاستیدا دەستە وەستان دەبێت و زمان لاڵ دەبێت لە ئاستیدا بەتایبەتی بۆ یەکێکی وەکو من کە هێندە

گوناهکارم لەدەشتی مەعسیەتیشدا هەتاکو پێم کرابێت قسوورم نەکردووە، هەرچی کاروکردەوەی پیسی شەیتانیش هەیە، جێبەجێم کردووە، کەواتە من مرۆڤێکی ڕوورەش و گوناهکارم و پێغەمبەریش(ﷺ) خاوێنەو مەعسوومە لە گوناە، هەرچی گوناە هەیە نیەتی بۆیە من ناتوانم هەستم بەمەدح و ستایشی ئەم زاتە کە پێغەمبەرە(ﷺ) لە پاشان ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) چ مەجبور بە مەدحی یەکێکی وەکو منە، پەکی لەسەر مەدحکردنی من نەکەوتووە، ئەوەندە بەس کە خوای گەورە لە قورئاندا مەدحی ئەو پێغەمبەرە دەکات و دەفەرموێت: (وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) (القلم ٤)، کەواتە گەر قورئان دەربارەی بەرزی هەرە لوتکەی ڕەوشتی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) بدوێت من هەر چیەك بڵێم ناگاتە ئەو مەدحی قورئانی پیرۆز:

نەکەم گەر مەدحی ئەوزاتەی کە فەخری جن و ئینسانە
مەڵێن خەڵکی (کەمالی) کافر وبێ‌دین و ئیمـــانە
گوناهکارم دەمم پیسە ئەگەر ناوی نەبەم هەقـــمە
چ مەدحێکی بکەم خۆمەدحی ئەو ئایـــەتی قورئـانە ل ١١٥

خوای گەورە لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرموێت (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك) واتە لەبەر تۆ نەبوایە ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بونەوەرمان دروست نەدەکرد.

کەمالی دەڵێ ئەو پێغەمبەرە شەفیعی ڕۆژی ئاخیرەتە، هەرکەسێکیش لای وابێت شەفاعەت ناکات بۆ ئێمە ئەوا نەفامە هیچ نازانێت:

شاهی لەولاکە شەفیعی ئێمە ڕۆژی ئاخیـــرەت
ئەحمەقە هەرکەس بڵێ لەولاکە فریاڕەس نییـــە ل ١١٦

سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ لە جۆرە ئاوێکە لە پشتی پیاو سینەی ژندا پاشان بە تێپەر بوونی قۆناغەکان دەبێتە کۆرپەلە (فَلْيَنظُرْ الإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ) (الطارق- ٧)، پاش ئەوەی هاتە دونیاوە، ئەو

تەمەنەی بۆی دانراوە لە دونیادا بەسەری دەبات، پاشان دەمرێت دەبێتەوە بە تۆزێك خاك لە زەویدا (مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى) (طه- ٥٤)

بەچی مەغروری خۆتو چۆرەئاوێك بوویت لە پێشانا

کە مردیشیت عەزیزم تۆزێ خاکی یا کەمێك گەردی ل ١٢٤

حەزرەتی عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) موعجیزەی ئەوەی هەموو هەرکاتێك پێویستایە مردووی زیندو دەکردەوەو کوێرو بەڵەکی چاك دەکردەوە بە ئیزنی خوا، ئێستا یار هەروەکو حەزرەتی عیسا خاوەن هەمان موعجیزەیە کاتێك کەوای لەسەرەمەرگەو یاردێتو دەمی دەخاتە دەمیەوە ئەوە دەبێتە شیفاو سەرلەنوێ گیان بەبەر کەمالی دەکرێتەوە (بِإِذْنِي وَتُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوْتَى بِإِذْنِي) (المائدة- ١١٠).

لەکاتی مردنا نایە دەمم دەم یاری بێدینـــــم

بە ئیعجازی مەسیحا هاتو تازەی کردەوە ژینم ل ١٤٩

حەزرەتی یەعقوب لەتاو دووری بێهەواڵی حەزرەتی یوسفی کوڕی کوێر بوو چونکە حەزرەتی یوسف چەند ساڵ بوو لێی دوور کەوتبۆوە، سەرەتای ونبوونی حەزرەتی یوسف لە دەشتی کەنعان بوو، کاتێك براکانی بەفێڵی سەیران بردیانو، پاشان فڕێیانداوە ناو بیر (وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ) (یوسف- ١٠)، پاشان لە میسر سەری هەڵداوە بەدیار کەوتەوە، لە دواییدا حەزرەتی یوسف لە میسرەوە کراسەکەی خۆی ناردو حەزرەتی یەعقوبی باوکی لە دوورەوە بۆنی کراسەکەی کرد (إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَا أَنْ تُفَنِّدُونِي) (یوسف- ٩٤)، لە دوایدا کراسەکەیان بەسەر چاویدا دادا، چاوەکانی چاك بونەوە (فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا) (یوسف- ٩٦).

کەمالی شاعیر سوودی لەم چیرۆکەی قورئانی پیرۆز وەرگرتوە لە قالبێکی شیعری دایڕشتوە:

حەزرەتی یەعقووب ڕەسـولی رەحمان
یەکێ لێی پرسی ووتی بەقـوربان
لە میسر بۆنی کراسـت بۆهات
خۆ بیـری کەنعـان نزیکـە لەلات

ل ١٧٨

کەمالی ئامۆژگای بەرامبەرەکەی دەکاتو دەڵێ تۆ هێنـدە بـەدوای دنیـا مەکـەوە گوێ لە دەنگی مەگرە نەوەك هەڵتخەڵەتێنێ ئەو دەنگە ناخۆشـترین دەنگـەو خـەڵکی بێزار دەکات، لە جیاتی تۆ گوێ لەم دەنگە ناخۆشە بگـری وەرە گـوێ لـە نالـەی دڵو دیقەت لە خادم بگرە.

خوای گەورە دەربارەی ناخۆشترینو بێزارترین دەنگ دەفەرموێت: (إِنَّ أَنكَرَ الأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ) (لقمان ١٩).

لەدەنگی (انکر الاصوات)ی دونیا بەسیە گوێ مەگرە
لە شوری نەی لە نالەی دڵ تۆ خادیم دیقەتێ بگـرە

ل ٢٠٣

جگە لەوەی کە لەدەستی مەعسیەتدا هیچ قـسوری نـەکردووە، هەرچـی لەدەسـتی هاتووە کردوویەتیو ئەسپی خۆی تیا تاوداوەو فەرمایشی شەیتانی جێبەجێ کـردووە، بەڵام سەرەڕای ئە هەموو شتەش کەمالی نائومێد نابێـت لـە عـەفووی خـوای گـەورە چونکە خوای گەورە بە تاكو تەنیاو هەقی زانیە، دیارە یەکێك لە ناوەجوانەکانی خوای گەورە (العفو) تاوان بەخشە:

لەدەشتی مەعسیەتدا تاکو توانیم ئەسـپی خـۆم رانی
بەجێم هێنا هەموو کردارو پیشەی پیسی شـەیتانی
لەگەڵ ئەم حاڵەشا یارەب لە عەفوت نائومێـد نابم
کە چونکە تۆم هەمیشە هەر بە تەنیاو تاكو هەق زانی

## سەرچاوەکان:

١- دیوانی کەمالی/ ئامادەکردن وساغکردنەوەو پێشەکی نووسینی/ کەمال عەلی باپیر، پێداچونەوەی شکور مصطفی/ وەزارەتی روشنبیری بلاوکردنەوەی کوردی، ژمارە ١٢٨، ل ١٧.
٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦.
٣- دیوانی نالی/ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی/ مەلا عبدالکریمی مدرس‌و فاتح عبدالکریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد/ بەغدا ١٩٧٦
٤- دیوانی زێوەر/ ئامادە کردنی محمود زێوەر/ دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٣، ل ١٣.
٥- دیوانی کەمالی/ ل ١٩.

# زێـــــوەر

عەبدوڵلا ئەفەندی کوڕی مەحەمــەد ئەفەندیــە لــە ســاڵی ١٨٧٥ زاییـنــی لەشــاری سولەیمان لەدایکبووەو، هەر لە سولێمانیش لە ساڵی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردووە.

زێوەری شاعیر سەرەتای خوێندنی لە حوجرەکــان دەســت پێکــردووە، فێــری زمــانی عەرەبیو فارسی بووە، هەربەمەبەستی خوێندن سەردانی ئاستانەی دەوڵەتی عوثمــانــی (ئەستەمبول) کردووە، لەوێش فێری زمــانی تــورکی بــووە.مانــەوەی زێــوەر لەشــاری ئەستەمبوڵ، وای کرد زێوەر ئاسۆی بیری گەلێك لەجاران فراوانتر بێت، ئەویش بــەهۆی تێکــەڵاوی لەگــەڵ ژمارەیــەکی زۆر لــە گــەورەپیاوانو ڕۆشــنبیرانی کــورد لەلایــەكو پێشکەوتنی شاری ئەستەمبولو نزیکی لە ئەوروپا ئاگــاداری لــەدوا گۆڕانکارییــەکانی (تەکنەلوژیا، فکری، زانــستی) لەلایــەکی تــر، ئەمانــە هــەموویان هۆکــار بــوون بــۆ پێشکەوتنی بیری زێوەر. پاش گەڕانەوەی زێوەر لە ئەستەمبوڵ بەکاری مامۆســتاییەوە خەریك دەبێت چونکە زێوەر دەرچووی قوتابخانەی فەرمی دەبێت دەکرێتــە مامۆســتای زمانی تورکی لە قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری.

مەحمود زێوەر دەڵێت: زێوەر بــە ڕابــەرو ڕێــچکەشکێنی قەڵاچـوکردنو نەهێــشتنی نەخوێندەواری دائەنێم لە کوردستاندا چونکە بەرلەوو تا سەردەمی ژیانی ئەویش کەس ئەو بۆچوونو ئەرکە پیرۆزەی نەبووەو نەیگرتۆتە ئەستۆی خــۆی(1). وەکــو لــە پێــشەوە ئاماژەمان پێکرد زێوەری شاعیر لەسەفەری ئەستەمبولیدا بەچاوی خــۆی پێــشکەوتنی ئەو شارەی دیوە، ئــەو قەناعــەتەشــی لــەلا پەیــدا بــووە، کــە ئــەو پێــشکەوتنە زادەی بەرهەمی خوێندەوارییە، بۆیە پاش گەڕانەوەی خۆی یەکالاکردۆتەوەی بە بلاوکردنــەوەی خوێندەواری، جگە لەوەی بــە مامۆســتای مــیری خــەریکی وانــە وتنــەوەو بــووە، لــە

هەمانکاتیشدا یەکەم یەکەم هاندەریش بووە بـۆ بڵاوکردنـەوەی خوێنـدەواری لـەکاتی شـەودا، فـەرموون ئـەوەتا مامۆسـتا جـەمال بابـان لـە پاداشـتی منداڵیـدا بۆمـان ئەگێڕێتەوە کە باوکی مودیری ناحیەی سروچك (بەرزنجە) بووەو (زێوەریش) ئەو دەمـە مامۆستای قوتابخانە بووە چۆن هانی خەڵکەی داوە دوای تـەواوکردنی کـارو فـەرمانی ڕۆژانە یان شەو بێن پێیان بخوێنێ.[٢]

کەواتە ئەوە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە زێوەر بێوچـان بەشـەوو بـەڕۆژ هەسـتی بەماندووبون نەکردووە لەبڵاوکردنەوەی خوێندەواری لەناو ڕۆڵـەکانی میللەتەکـەی، بـۆ ڕاستی ئەم قسەیەش دیوانی زێوەر کە پڕە لە شیعری پەروەردەیی‌و شیعری منداڵان.

زێوەری شاعیر پیاوێکی نەفس بەرز بووە، خاوەنی قەناعەتێکی باش بـووە، ئامـادە بووە بە بڕە پارەیەکی کەمی خانەنشینی ژیانی خۆی‌و ماڵو منـداڵی پێبـژێنی، بـەڵام هیچ کاتێك ئامادە نەبووە دەسـت لەخـەڵکی پـان بکاتـەوە، یـاخود بەشـیعرەکانیەوە کەسابەت بکات، هەرجارەی بەشانو باڵای یەکێکدا هـەڵبێ لـە بەرامبەریـدا کـەمێك پارە وەربگرێ، ئەوەتا زێوەر کاتێـك نامیلکـەی خێـوی ناومزگـەوت‌و سـوفی کـەریمی چەرچی پێشکەش بە حەسەن بەگی جاف دەکا دەڵێ (تا عـومرم گەیشتوتە ئـەم وەقتـە شیعرفرۆشیم نەکردووە ئێوەش هەروای بزانن بەگم [٣]).

من وای بۆدەچم نەفس بەرزی‌و قەناعەت زۆری زێوەری شاعیر بۆئـەوە دەگەڕێتـەوە، کە پیاوێکی لەخواترس‌و بەدین بووە، ئەو لەخواترسیەی ئەوجۆرە کەسایەتیەی زێـوەری دروست کردبوو.

عەلی باپیر ئاغا لە نامیلکەی گوڵدەسـتەی شـوعەرای هاوسـەرم دا دەڵێـت زێـوەر لەسەر ئامەدانی شوعەرای دەوری دواییـە لـەناو هاوتەمەنـەکانما، شـیعری زێـوەر لـە هەموویان ڕەوانترو ناودارترە، وەك لە شـیعرا باڵایە لە دیانەت‌و ئـەخلاقی چاکیـشدا دوو باڵایە.[٤]

هەروەها پیرەمێرد دەڵێت: زێـوەر ئـەخلاقی لـە شـیعری جـوانتر بـوو بـە هـەموو مەعنایەکەوە دیندارو بەویقارو قەناعەتکار بوو.[٥]

زێوەر لە هۆنراوەیەکیدا باس لە ژیانی ئارەق خواردنەوە دەکا، گەرچی ئەو هۆنراوەیە دەچێتە قـالبی هۆنراوەیـەکی کۆمەڵایەتیـەوە، بـەڵام لـە هەمانکاتیـشدا ناوەخنـانی هۆنراوەکە بابەتێکی ئاینی گرنگ دەرژوێنێ:

عەرەق ناخۆم کە تووشی دەردی سـەربم
گرفتاری هەزار دەردو خەتـەر بم
هەرچی خوا حەز نەکا ئەیکەم بە سرِری
ئیتر بۆ شەرمەزاری ناو بەشـەر بم
عەرەق ناخۆم کە عومرم کورتو کەم بێ
بەجوانی بۆ گرفتـاری زەرەر بم
عەرەق ناخۆم کە دووچـاری وەرەم بم
هیلاکی خەستەکی قەلبو جگـەر بم
عەرەق ناخۆم کـە مقطوع النسـل بم
حەز وایە کەبـابی سەدپسـەر بم

زێـوەر شـاعیری هەوڵیـداوە لـەڕێگای ئـەم هۆنراوەیـە، کێـشە کۆمەلایەتیـەکان زەرەروزیانی عەرەق بخاتە ڕوو، کە ئەمانە هەموو زیانـەکانی دنیایـە، بـەڵام لـە ڕۆژی حەشریش کە مرۆڤـ کۆدەکرێنەوە لەبەردەم دادگای خوا ڕادەوەستن پیاوی عـەزەق خـۆر بەرەو ڕووی ئاگری دۆزەخ دەبێتەوە:

عەرەق ناخۆم ئەڵێن ((داء الکؤول))ـە

زێوەری شاعیر گەلێك بێزارە لەبۆنی پیسی عەرەق، جگە لەوەش ئامادەیـە هـەموو فەرمانێکی خوای گەورەو پێغەمبەر(ﷺ) جێبەجێ بکـات (اطیعوا الله واطیعوا

الرسـول).

لە بۆنو بۆگەنی بێزارە تەبعـــــم

فیدای ئەمری خوداو پێغەمبـەر بم　　　　ل ٤٣

زێوەر کەوتۆتە ساڵەوە ریشی سپی بووە، بـەڵام ریـش سـپیەکی رووزەردو دڵڕەش‌و ئاخرشەرە، کە ئەمانە هەموو وای کردووە ببێتە مرۆڤێکی بێقیمەت لەهەردوو جیهان هەم لە دنیاو هەم لە قیامەت:

ڕیش سپی، روو زەردو دڵ ڕەش پیری ئاخر شەڕ منم

لەم جیهان‌و لەو جیهان بێقیمەت‌و بێفەر منـــــم

شاعیر هێندە لە کردەوەکانی خۆی ورد دەبێتەوە، هیچ کردەوەیەکی چاکی نیە، ئـەم بێکردەوەیەش وای کـردووە لـەڕۆژی گردبونـەوەی مرۆڤـەکان لـە مەیـدانی مەحـشەر شەمەزار بێت.

زێوەر بروای تەواوی بە زیندوبونەوەو حساب‌و لێپرسینەوە هەیە:

هەرلەم ڕۆژەشدا هەرکەس کتابی کردەوەکانی ئەدرێتـە دەسـت ئـەو کتابـەش هـیچ شتێکی لەبیرنەکردنەووەو هەموو تۆمارکردووە:

کردەوەی چاکم نیە وەختی کە سەیری خۆم ئەکەم

خاکسارو شەرمەزاری دەشتەکەی مەحشەر منم

ئێستا زێوەر جلەوی بۆ نەفسی خۆی شل کـردووە، ئەمنیـشی بـە ئـارەزووی خـۆی هەرچیەکی بەوێ پێدەکا، (إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ) (یوسف- ٥٣)، زێـوەریش هـیچ قسوری نیە لەدنیادا، بەڵام لەڕۆژی لێپێچینەوە پەکی کەوتوە سواری سـیارەیەك بـووە کە پەکی رۆیشتنی کەوتووە پەنچەرە:

ئێستا سواری ئەسپی نەفسم بۆ چەپ‌و راست لنگ ئەدەم

رۆژی ئاخر صاحێبـی سـەیارەی پەنچــــەر منم　　　　ل ١٩

بەڵام زێوەری شاعیر لەگەڵ ئەم هەموو خراپەیەی خۆی نائومێد نابێت دەپاڕێتەوەو دەڵێت گەر خودایە تۆ لەبەر دەرگای خۆت دەرم بکەی من چی بکەم؟ کێ هەیە دەرگام لێ بکاتەوە، چونکە لە ڕۆژەدا ڕووڕەشم کەسێك نیە پەنای بۆ ببەم.

ڕوو لەدەرگای کێ بکەم، گەر تۆ دەرم کەی چی بکەم

ڕوو ڕەش و بێئیلتیجاو بێکەس و موظطەر منم ل ١٩

دەروێش کۆمەڵێك پیاوی خواناسن، سەر بە ڕێباوی قادرین، خۆیان یەکالا کردۆتەوە بۆ خواپەرستی شوێنەکەشیان تەکیەی پێدەڵێن، سۆفیەکانیش بە هەمان شێوە، بەڵام سەر بە ڕێبازی نەقشبندین لە خانەقا کۆدەبنەوە زێوەری شاعیر باس لە دەروێش شەریف دەکا دەڵێ مادام دەروێشە بۆ دەست بە ذکری خوا ناکات، وەئەگەر سۆفیە بۆ ناچێتە خانەقا:

ئەگەر دەروێش شەریف دەروێشە بۆ ذکری خودا ناکا

وەگەر خۆ سۆفییە بۆ ڕوو لە خەتمە خانەقا ناکا ل ٣٠

شیعە مەزهەبەکان هەڵەی گەورە دەکەن، کە هەموو کاتێك جنێوو قسەی ناڕەوا بەرامبەر عومەری کوری خەتاب دەکەن، بەڵام سونە مەزهەبەکان عومەریان خۆشدەوێ، جا دەبێت دەروێش شەریف سونی بێت ئینجا قسەوجنێو بە عومەر دەدات.

جا ئەگەر بەم پێوەرە بێت دەبێت بۆ غەیری سونە مەزهەب ڕەوایێت جنێو بدات بە عومەر، بەڵام زێوەری شاعیر هەرگیز نایێت مەستی ئەوە بێت، بەڵکو وا باوە کە شیعە جنێو دەدەن بەعومەر، بەڵام سونە بە پێچەوانەوە عومەریان خۆش دەوێت، کەچی سەرەرای ئەوە کە دەروێش سونە مەزهەبیشە ئینجا هەر جنێو دەدات:

ئەگەر سونی ڕەوشتە سەبی عومەر بۆ ئەکا دایم

وەگەر خۆ شیعەیە بۆ ڕوو لە سەختی کەربەلا ناکا ل ٣٠

شاعیر لە هۆنراوەیەکی پرسیارو وەڵامدا باس لە عەقیدەی ئیسلام دەکات کە دەڵێت پێویست بەوە ناکات مرۆڤ لە دنیادا حساب بکات بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵام گەر مرۆڤ حساب بۆ ڕۆژی دوایی نەکات، چۆن لە ڕۆژی دوایی کاتێك مرۆڤ گرد دەکرێتەوە حسابی لەگەڵ دەکرێت چۆن وەڵامی خۆی دەداتەوە (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) (المطففين- ٦).

من ئەڵێم لازم نیە فێر بم لە دنیادا حساب

پێم ئەڵێن ئەی چۆن نەجاتی خۆت ئەدەی ڕۆژی حساب

زێوەر دەڵێت بەسە بۆ ئەوەی خوا لێترازی بێت، خۆشەویستی ئالو بەیتی پێغەمبەرت(ﷺ) هەبێت، بەڵام ئەهلی سونەو جماعە دەڵێن نەخێر هەر ئەوەندە بەس نیە، بەڵکو دەبێت خۆشەویستی یاوەرەکانی پێغەمبەریشت هەبێت بۆ خوا لێ ڕازی بوون، چونکە ئەمانە پشتیوانی پێغەمبەر(ﷺ) بوینە لە ڕۆژە سەختەکان خوای گەورە دەفەرموێت: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ) (فتح- ٢٩).

من ئەڵێم هەر باری عەشقی ئالی حەیدەر کافییە

ئەهلی سونەت پێم ئەڵێن سەرباریە حوببی صەحاب

لەکاتی سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام لە نیمچەدورگەی عەرەب، موسڵمانەکان زۆر ئازار دەدران لەلایەن قورەیشەکانەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە هەندێك لە موسڵمانەکان کرد کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، نەجاشی حەبەشی کە سەرۆکی وڵاتی حەبەشە بوو، موسڵمانەکانی داڵدەداو یارمەتی زۆریشی دان، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم چاکەیەی لەبەرچاو بوو، کاتێك مرد، نوێژی مردووی بەغائب لەسەر کرد، جا چاکەو پیاوەتی ئەم پاشایە هەموو دنیا دەیزانی:

چونکە ئەووەڵ خزمەتی ئیسلامەکانی کرد حەبەش

ناوی چاکەی باقییە لای ئەوروپاو ئاسیا ل ٦٤

نەفسی مرۆڤـ هەردەم هەول دەدا بەدوای ئارەزووەکـانی خـۆی بکـەوێت (إِنَّ الـنَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ) (یوسف- ٥٣)، ئەم نەفسە هێندە لـەخۆی رازیـە، هـەروەکو فرعـەون وایــە کــە خــۆی زۆر بەگــەورە دەزانــیو داوای خوایــەتی دەکـرد (...أَنَـا رَبُّكُـمُ الأَعْلَى)(النازعات- ٢٤) جا بەسە ئەی نەفس هەتاکەی ئاوا غەروورده‌بی.

ئەی نەفسی دەنی هەروەکو فیرعەونی لە کیبرا

ئەم هەشمەتو مەغرورییە تاکەی لە هـەموولا        ل ١٠٨

ئەم هیلاکەتیە کە بەهۆی نەفسەوە تووشم بووە وا لـە فرمێسکی چـاوەکانم غــەرق بووە، بەڵام بۆ بەهانا هاتنم خاوەنی دەستی سپی(یەدی بەیضا) کە مەبەست حـەزرەتی موسایە، کە هەرکاتێك دەستی لە باخەڵیا دەنا دەستی سپی دەبوو:

بۆ غەرقو هیلاکەت لەشەتی ئەشك دەمادەم

پەیدا بووە وا صـاحێبی حوسنو یەدی بەیضا        ل ١٠٨

بازار سەرتاپا گیراوە، هەروەکو ئەوڕۆژەی حەزرەتی (یوسف) یان هێنا بازار بۆ فرۆشتن (وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنْ الزَّاهِدِينَ) (یوسف- ٢٠).

بازاری هەموو گرتووە، وەك یوســـــفی ثانی

لافی ئەوەیە زیندە بکا دینی یەهــــــــوودا

تۆ ڕاوەستەو ئێستا گوێ مەگرە لە قسەی پیاوخراپان کە هەردەم دەیانــەوێ فیتنــەو ئاشوب پەیدا بکەن، هەروەکو چۆن هامان کە پیاوێکی سیحربازبوو فیتنەو دووبەرەکی بەهۆی سیحرەکانیەوە پەیدا دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت:

گوێ مەگرە لە ئەقوالی ڕەقیبی وەکو هامان

ئیظهاری مەکە فیتنــەو ثابیت مەکە دەعوا        ل ١٠٨

زوڵفی ڕەش لای شاعیرانی کلاسیکی رەمزە بۆ مار، کەواتــە زولفـەکانی تــۆ وەکـو مارەکانی فیرعەونە کاتێك ساحیرەکانی فیرعــەون هــاتن بەرامبــەر موسـا رایـانگرت

(فَـأَلْقَى عَـصَاهُ فَـإِذَا هِـيَ ثُعْبَـانٌ مُـبِينٌ) (الاعـراف- ١٠٧)، روخساریـشت هـەروەکو گەنجینەکانی قارِوونە، ئەم قارِوونە کە دەوڵەمەنـدێکی سـەردەمی موسـا بـوو هێنـدە دەوڵەمەند بوو کلیلی خەزنەکانی چەند پیاو هەڵیان دەگرت، پاشان بـەهۆی سەرپێـچی خۆیو ماڵەکەی لەناوچوو (إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِـنْ قَـوْمِ مُوسَـى فَبَغَـى عَلَـيْهِمْ وَآتَيْنَـاهُ مِـنْ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ) (القصص- ٧٦)، (فَخَـسَفْنَا بِـهِ وَبِـدَارِهِ الأَرْضَ) (القصص- ٨١).

زولفت چییە، ڕەش ماری دەمی ساحیری میـسـرە
چیهرەت چییە خەزنەکەی زەڕی (قارِوونە) لە دنیا ل ١٠٨

شاعیر خۆی بە حەزرەتی یەعقوب شـوبهاندوە، کاتێـك یوسـفی کـوڕی بـۆ مـاوەی چەندساڵ بزربوو لێی، لەداخی دووری یوسف چاوەکانی کـوێر بـوو، پاشـان کراسـەکەی یوسفیان بۆ هێنا چاوی چاك بۆوە، (زێوەر)یش خۆی بەخۆشحاڵ دەزانێت هەروەکو چۆن چاوی چاك بۆوە ئەویش کە کەوکەبی روخساری لەخەودا دیووە زۆر خۆشحاڵە (فَلَمَّـا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا) (یوسف- ٩٦).

ئەتۆ وەك یوسفیو من لە چاهی میحنەتا بەنـــــدم
ئەما من دیم لەخەودا کەوکەبی ڕوخساری ڕەخشانت ل ١١٣

زەمزەمو کەوثەر، دوو ئاوی پیرۆزن، یەکێکیان لـەدنیا هەیـە زەمـزەم کـە هاجـەرو ئیسماعیل هەڵیانکەند ئێستاش حاجیەکان دەیهێننەوە بۆ موتفەرك ئاوی کەوثـەریـش لە ڕۆژی دوایی موسڵمانانی ئەهلی بەهەشت لێـی دەخۆنـەوە (إِنَّـا أَعْطَيْنَـاكَ الْكَـوْثَرَ) (الکوثر- ١).

زەمزەمە یا کەوثەرە چاهی زەنەخ
لەعلە یا یاقووتە لێوی ئەحمـەرت

هارووت مارووت دوو فریشتەن (وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ) (البقرة- ١٠٢).

ئەوشتانەی کە مەشهورن لەناودا لەبابەتی ئەم دوو فریشتەوە کـە گـیرۆدەی گونـاهو تاوان بوون وە خودای تەعالا خاتر خۆی کردوون لە بەینی عـەزابی دنیـا یـان عـەزابی قیامـەت... ئـەوانیش عـەزابی دنیایـان ئیختیـار کـردووە ئەوانـە ئێـستا لـە چالێکداهەڵاسراون لە (بابل)دا وە تاقیامەت بەوجۆرە دەمێننەوە لەسـەر فـەرموودەی زانایانی تەفسیر ئەساسیان نیە وە لە ئەحادیثی صەحیحەدا نیە وە موخـالیفی نەصـی قورئانە چـونکە خـودا لەباسـی فریـشتەدا ئەفـەرموێت: (لاَ يَعْصُونَ اللَّـهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ) وە تەفسیری بیضاوی رەدی ئەم شتانە ئەکاتـەوە فـەخری رازیـش بەو قسانە رازی نیە(٦).

کەسبی هارووتی ئەکا چاوی ڕەشـت
چەندە فەتتانە جەمالی ئەسـمەرت ل١١٥

خوای گەورە موعجیزەیەکی گەورەی دابووە حەزرەتی سلیمان کە زمـانی گیانـداری دەزانی (يَاأَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ) (النمل- ١٨)، جارێك حەزرەتی سـلیمان بـەخۆیو لەشـکرەکەیەوە دەرویـشتن نزیك بونەوە لەشارە مێروولەیەك، یەك لـە مێروولـەکان گـوتی بـە مێرولـەکان بـچنە کونەکانتانەوە نەوەك سلیمانو لەشکرەکەی لەژێر پێیەکانیان پانتـان بکەنـەوە (يَاأَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لاَ يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لاَ يَشْعُرُونَ) (النمل- ١٨) ، زێوەری شاعیریش هەروەکو ئەو مێرولە کەوتۆتە ژێرپێیان، بەڵام با خەڵك دڵنیا بن من وەکو سلێمانم:

بە میثلی مووری بێچارە لەبەرپێی هەرکەسا کەوتووم
هەتا رەنجیـدە خاطر بێ لە من شـاهی سـلێمانم ل ١٢٣

مرۆڤ موخەیەرە لە مابەینی کاری خراپو چاکدا، بەڵام ئەوەی بە مرۆڤی دەکاتو لەڕێگا لادەدا نەفسی خراپی خۆیەتی، چونکە نەفسی مرۆڤ هەردەم بەرەو کاری نارێك دەڕوا.....) کەواتە زێوەر دەڵێت هەر نەفسی خۆم بەرەو هەڵدێرو کارو کردەوەی خراپم دەبات کەس تر نیە.

بۆچی بوختان کەم کە شەیتانە گوناهم پێ ئەکا

من چ شەیتانم نییە هەر نەفسمە شەیتانی خۆم　　　ل ١٤٤

چیرۆکی نەمروود حەزرەتی ئیبراهیم لە قورئاندا زۆر روونو ئاشکرایە، کاتێك خەڵکی هەموویان بۆ سەیران دەچن (دەڵێن ئەو ڕۆژە نەورۆز بووە) بەڵام حەزرەتی ئیبراهیم دەفەرموێت (إِنِّي سَقِيمٌ) واتە نەخۆشمو ناتوانم، کاتێك خەڵکی دەڕوا بۆ گەشت، حەزرەتی ئیبراهیم دەچێتە بتخانەکەیان هەموو بتەکان دەشکێنی تەنها گەورەکە نەبێتو تەورەکە لەسەرشانی دادەنێت، کاتێك دەگەڕێنەوە پرسیار دەکەن کێ خواکانمانی شکاندووە؟ دەڵێن: (قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ) (الانبیاء ٦٠)، حەزرەتی ئیبراهیمیش لە وەڵامدا دەڵێت: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِنْ كَانُوا يَنطِقُونَ) (الانبیاء- ٦٣)، ئینجا ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە حەزرەتی ئیبراهیم ئەخەنە ناویەوە، بەڵام ئاگرەکە فەرمانی پێدەکرێ ساردو سەلامەت بێت (قُلْنَا يَانَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ) (الانبیاء- ٦٩)، ئەم بەسەرهاتە سەردەمی نەمروود بووە لە پاشان خوای گەورە بەهۆی مێشوولەیەك گیانی؟؟؟؟

گیرۆدەی نەمرود میزاجێکە دڵی مـــن

بێبت شکەنی داخڵی ناو کوورەی نـــارم　　　ل ١٢٨

زێوەر باسی دەستەیەك دەکا، کە هەموویان وەك مامز جوانن، جوانیەکەیان وەکو جوانی حەزرەتی یوسف وایە، کاتێك ئافرەتانی میسر گلەییان لە خێزانی عەزیزی میسر دەکرد ئەویش گوتی یوسف زۆر جوانەو گلەیم لێ مەکەن گەر دەتانەوێ تاقیتان دەکەمەوە، میوە بۆ دانان هەریەکە چەقۆیەکی دادەستیان، ئینجا یوسفی هێناو پێی

نیشاندا، ئەوانیش سەرسام بوون لەجوانی یوسف، ئاگایان لەخۆ نەما دەستی خۆیان بە چەقۆکە بڕی (فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا) (یوسف- ٣١).

جا ئەم جوانانەی زێوەر باسیان دەکا وەکو حۆری بەهەشت وان سوندس‌و ئستبرق دەپۆشن (وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِنْ سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الأَرَائِكِ) (الکهف- ٣١).

ئەم دەستە کە لەم شارە هەموو نەوعە غەزالی
هەریەك بە جەماڵ یوسفی با جاهو جەلالن
غیلمان صیفەت سوندوس‌و ئیستەبرەق ئەپۆشن
صورەت بەشەرن مەعنا هەموو حوور خیصالن ل ١٣٤

زێوەر ئەوەندە ئاه هەڵدەکێشی دنیا بەجارێك بۆتە تەم، فرمێسکی چاوەکانیشی هێندە هاتۆتە خوارەوە وەکو ئاوی زەمزەمی لێهاتووە کە هەرگیز وشك نابێت کەسیش ناتوانێت لێوی ماچ بکات هەروەکو روکنی یەمانی کە ماچکردنی دروست نیە:

دنیا کە لەبەر قافلەی ئاهم تەمە ئەمڕۆ
شۆڕاوی سورشکم بەمەسەل زەمزەمە ئەمڕۆ
لێوت کە عەقیقە بووەتە ڕوتنی یەمانی
ماچی کە جەوازی نییە جێی پەنجە ئەمڕۆ ل ١٣٧

زۆر بەداخەوە بۆ ئەو روخساری فریشتەیە کە لە بەهەشتدا ئەو بەدکارە بۆ هاودەم‌و هاونشینت، کاتێك ئادەم حەوا لەبەهەشت بوون شەیتان تەفرەی دان تووشی گوناه تاوانی کردن، خوای گەورەش لەبەهەشت دەری کردن (قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ) (الاعراف- ٢٤).

ئەی چیهرە مەلەك حەیفە ڕەقیب بۆتە ئەنیست
لەو جەننەت‌و فیردەوسە ئەو ئیبلیسە بەدەرکە ل ١٤٣

زێوەر لە هۆنراوەیەکیدا کە ستایشی پێغەمبەر(ﷺ) دەکا، کە ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) خوا پێدراوە لە هەردوو جیهان دنیاو قیامەت گەورەی هەردوو دنیایە، هەر ئەو گەورەییە وای کرد کە خوای گەورە دەعوەتی بکات لەشەوی میعراج، کە هیچ پێغەمبەرێك ئەوەی بۆ نەکراوە، ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) لە عەشیرەتی قورەیشە گەورەی هەموو پێغەمبەرانە هەرکەسێکیش بچێتە بەردەرگای بۆ عیلاج ئەوا دەرمانی هەموو دەردێك لای ئەوە یاخود دەکرێت بڵێین هەرکەسێك لەسەر ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) بڕوات ئەوە عیلاجی دەردی دەکرێت:

نەعیمی هەردوو جیهان پێت بڵێم بەتۆ کە چیە؟
گەدایی دەردی سولتانی صاحێبی میعراج
موحەممەدی قورەیشی سەییدی جەمیعی ڕوسول
کە خاکی دەرگەهی بۆ دەردی هەر دڵێکە عیلاج ل ٢٠٩

گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) واتە ڕازی بوونی خوا لەو کەسە، یەکێکیش لەکارە باشەکانی مرۆڤ دەیکات دروستکردنو ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتە (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ) (التوبة- ١٨)

کەسێ موطیعی خواو ڕەسووڵە
لە ڕێگەی دیندا لیرەی لاپووڵە
انما یعمر مساجد الله
لەبۆ ئەمثالی حاجی ڕەسووڵە

شەهیدبوونی (حسین کوری عەلی (ﷺ)) لەنزیك شاری کەربەلا بەدەستی سوپای ئەمەویەکان، کاتێ زیدی کوڕی معاویە خەلیفە بوو، (شمر)ی نارد بۆ لەناوبردنی ئالو بەیتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ڕۆژە بۆتە ڕۆژێکی گەلێك شوم لە مێژووی ئیسلام:

ڕۆژی طوغیانی وەلادەن کەوتە یادی ئەهلی دین
واقیعەی قەتلی حوسەینو فاجیعەی ڕۆژی شومار ل ٢٣١

شێخ سەعیدو شێخ ئەحمەد لەساڵی ١٣٢٦ شەهید بوون لەشاری موسل کە ئەمانە نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەکو حسین کە بەدەستی زەید شەهید بوو، بەڵام حسین (رضي الله عنه) لەدەشتی کەربەلا، شێخ سەعیدو شێخ ئەحمەد لە (باب السرا) لە موسڵ:

کووفەیی وەك ئەهلی مەککە وان لە نیسبەت موسلا

ڕەببی وێران بێ بەبادی فیتنەو تەزویری نار

میللەتی وا تووشی زیللەت بێ لەدنیاو ئاخیرەت

بوو بەدەشتی کەربەلا (باب السرا) بۆ ئینتیحار ل ٢٣١

سەرچاوەکان:


١- دیوانی زێوەر/ کۆکردنەوەو پێشەکی پەراوێزی بۆ نوسیوە/ محمود زێوەر/ دەزگای ئاراس/ ٢٠٠٣، ل ٨.

٢- سەرچاوەی پێشوو.

٣- سەرچاوەی پێشوو.

٤- سەرچاوەی پێشوو ئەویش لە نامیلکەی گوڵدەستەی شوعەرای هاوی سرم

٥- سەرچاوەی پێشوو ئەویش لە دیوانی پیرەمێرد/ پێداچونەوەیەکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی لە بەرگی یەکەم ل ٣٧/ دەزگای ئاراس/ ٢٠٠١.

٦- تەفسیری نامی/ بۆ قورئانی پیرۆز/ مەلا عبدالکریمی مدرس/ بەرگی یەکەم/ ١٧٥، چاپخانەی الوطن العربی.

# ئـەسـیـری

عبدالخالق ئەسیری (١٨٩٠-١٩٦٢) لـە شـاری کـەرکوك لـەدایکبووە، هـەر لـەو شارەش کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی شێخ محێدین نێژراوە ئەسیری براگـەورەی نەجمەدین ئەفەندی خوێندنی لە ئەستەمبول تـەواو کـردووە، بەشـداری لـە ڕێکخـراوە کوردیەکانی تورکیـا کـردووە، ڕۆلی گـرنگو بەرچـاوی هـەبووە لـە یـەکگرتنی ئـەو ڕێکخراوانە پاش ڕاوەدونانی کوردە نیشتمانپەروەرەکان، لەلایـەن تورکـە کەمالیـەکان چۆتە بولگاریا، تاکو جەنگی دووەمی جیهانی سۆراغی زانراوە، لەدوای ئەوە بێسـەرو شوێن بووە[1].

سەرەتای خوێندنی ئەسیری لە قوتابخانەو حوجرەکان بووە، گەلێك لە ناوچەکانی کوردستان گەراوە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ئاسۆی بیری گەلێك فراوانتر بووە.

ئەسیری لەماوەی ژیانیدا سـەفەرێکی شـاری ئەسـتەمبولی کـردووە، لـەوێ چـاوی بەگەلێك لە پیاوە ناودارەکانی کورد کەوتووە، ئاسۆی بیری گەلێك فراوانتر بووە.

ئەسیری شاعیر لە دوو لایەنەوە کاریگەری ئاینی لەسـەر بـووە، لەلایـەك خوێنـدنی حوجرەیو زانستەکانی شەرعیو علومی قورئان لەلایەکی تریشەوە ئەسیری کاریگـەری خانەقاو تەریقـەی نەقـشبەندی پێـوە دیـارە، ئەمانـە وایـان کـرد لایـەنی ئـاینی لـە هۆنراوەکانی رەنگ بداتەوە.

ئەسیری لە دیدو بۆچونێکی ئیسلامیەوە دەنوارێتە هەبوونی خوای گـەورە، خـوا بـە ئەزەلی تێدەگا (ئەزەل) واتە شتێك سەرەتای نەبێت، کە شتەکە سـەرەتای نەبوو

کۆتایشی نیە، کەواتە لە سەرەتادا هیچ شتێك نەبووە، جگە لە ذاتی خوا:

خوا هەبوو لە کۆنا هەر هەبـــوو

بێجگە لەخواکەسی تر نەبـــــوو ل ٨٥

لە پاشان خوای گەورە ویستی بونەوەر دروست بکات، وەهەرچی لـەناو بونەوەردایـە خۆی دروستی کرد، مەبەست لەو دروست کردنەش ئەوەیە کە توانـاو گـەورەیی خـۆی بسەلمێنێ (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِي) (الذاريات- ٥٦).

هەرچی کە هەیە خوا پەیدای کــرد

داخۆی بناسن بۆیە ئاوای کـــــرد ل ٨٥

پاشان خوای گەورە ئەرزو ئاسمانی دروست کرد بۆئەوەی خـەڵکی تێـدا بـژی، جگـە لەوەش گیانلەبەرو درەختیشی ڕوواند بۆ ئـەوەی مرۆڤـ لەبەرهەمەکـەی بخـوات تێـدا بحەوێتەوە (وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّـامٍ وَكَـانَ عَرْشُـهُ عَلَـى الْمَـاءِ) (هود- ٧)، پاش ئەوەی مرۆڤـ لەسەر زەوی هەموو پێداویستیەکانی ژیـان ئامـادەکرا بۆ بتوانریت مرۆڤ تێدا بژین خوای گەورە هەستا بەدروستکردنی باوکە ئادەمەوە کە بە خەلیفەو جێنشینی خوای گەورە لەسەر زەوی (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَـةِ إِنِّي جَاعِـلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا) (البقرة- ٣٠).

بەڵام دروستکردنی باوکە ئادەم لەخۆڵ بووە (كلكم من ادم و ادم من تراب)

لەپاش ئەمانە لە خاکـــــی زەوی

ئادەمی پەیدا کرد تەنهـــا بێوەری ل ٨٥

پاش باوکە ئادەم، حەزرەتی جەواش دروستکرا، هەردووکیان بونە ژنو مێرد، لەبەهەشت نیشتەجێ بوون (وَقُلْنَا يَاآدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا) (البقرة- ٣٥).

بوونە مێردو ژن هەردوو یەکیـــان گرت

بۆ جەنناتولعەدن ڕێیان لەبەر گـــــرت ل ٨٥

زانایانی (مادی) پێیان وایە کە هەموو شتێك لە (مادە) دروست دەبێت، بێبوونی مادە دروست بوونی شت مەحاڵە، تەنانەت هەندێك پێیان وایە بەهۆی بوونە ئەو مادانە بونەوەر بە ڕێگای ڕێکەوت (صدفە) دروست بووە بەڵام لای زانایانی ئاینی خوای گەورە دروستکەری هەموو شتێکە لە بونەوەر (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ) (يس- ٨٢).

فەرمەسۆنان وادەڵێن بێ مادە پەیدا نابێ هیـــچ
مادە نەبوو چۆن پەیا بوو ئەو سەحابو ڕەوشەنات ل ٨٧

خوای گەورە لە ئەزەل بڕیاری دروست کردنی مرۆڤ ئاسمانو زەوی ئەوانی تری هەبوو، هەتا گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) پەیامی ئیسلامی پێبەخشی، کە قورئانیش ببێتە دەستورو یاسای ئەم پەیامە (إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ) (الاسراء- ٩)

نەوعی بەشەری خوا مەدەنی خەلقو پەیـــاکرد
قورئانی بەدەستوری عەمەل بوون ڕەوا کــــرد ل ٨٩

ئەسیری ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) دەنوسێتەوە، کە لە شاری مەکە لەدایکبووە کە ئەوکات شاری مەکە دوور لە عیلمو سەنعەت بووە، قوتابخانەو خوێندەواری ئەوکات گەلێك لەوشارە کەم بووە.

نیشتمانی مەککە بوو مەککەش لە عالەم مونـــزەوی
دەستی تەعمیری نەدابوو دەوڵەتی عـــــالەم بەدی
دوور لە عیلمو سەنعەت شـــــارانی گەورانی زەوی
مەدرەسەو مەکتەب نەبوو یەك یەك هەبوو نوسەر لەوی ل ٩٠

پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری مەکە لەدایکبووە، بەڵام پێش لەدایکبوونی باوکی کۆچی دوایی کردووە لە نێوان شاری مەکەو مەدینە.

مەنشەئی کوی بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا
خۆی لەدایك بوو لە مەککە لای مەدینە بابی مرد

پاشان باپیری عبدالمطلب دەیگرێتە خۆی پـەروەردەی دەکـا لـە تەمـەنی دووسـاڵیدا باپیریشی کۆچی دوایی کرد، لە شەش ساڵەش ئامینەی دایکی کۆچی دوایی کرد:

بوو بە دوو ساڵە کەچی باپیری، بابی بابـــــی مرد

قدرة الله هەر کە شەش ساڵەی تەواو کرد داکی مرد ل ٩١

عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەب دابوو نەریتیان وابوو، منداڵی شـیرە خۆرەیـان دەبردە دەشـت بـۆ پـەروەردە کـردن، لەبـەر دوو هـۆ، یەکـەمیان زمـانی پاراوبێـتو دووهەمیان تەندروستی باش بێـت، پێغەمبـەریش(ﷺ) بـە دەسـتووری ئـەو ڕۆژگـارە دەیبەنە دەشت، دایەنێك بەناوی (حلیمەی سعدیە) دەبێتە دایەنیو بەخێوی دەکا:

شیرەخۆرە چو بەدایەن دایەنی لادێیـــی بوو

ڕووتەڵو بێخانمانو بێنوێنو ســــــایە بوو ل ٩١

خەدیجەی کچی خویلد ئافرەتێکی دەوڵەمەندی شاری مەکە بوو، پارەیـەکی زۆری دا بە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بازرگانی لە ڕێگای شام، کاتێك کاروانەکە گەڕایەوە، قـازانجێکی زۆری کرد لەبەر دەست پاکی پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) دەچووە ئەشکەوتی حەرا بۆ خواپەرستی نزیك شـاری مەکـە، هـەتا جارێك حەزرەتی جوبریل هاتەلای سورەتی (اقرا) بەسەردا بخوێنێتەوە:

قافڵەی خاتوو خەدیجەی بردە شامو هاتــــەوە

دەچووە ئەشکەوتی حەرا ڕۆژی شەپرزە هاتەوە ل ٩١

کاتێك دەگەڕێتـەوە شـەپرزە دەبێـتو بەسـەرهاتەکەی بـۆ خێزانـی خـۆی خەدیجـە دەگێڕێتەوە، مزگێنی پێغەمبەرەیاتی دەداتێ:

سوورەیی (اقرا) مەلایك پێمی وت خۆنرایـــەوە

ست خەدیجەو خاڵی وتیان تۆ (رسول الله)ی ئەوە

پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بووە پێغەمبەر بۆ ماوەی (١٠) ساڵ بانگەوازی ئاینی ئیسلامی لەشاری مەکە کرد، دیارە لەو ماوەیەدا گەلێك ئازارو ئەشکەنجەی بینی بەدەست قورەیشەکان:

تاکو دەساڵ دەعوەتی خێڵی قورەیشی لێ کرا
کەڵکی چەندانی نەبوو ئەو سەروەرە ئەزیەت کرا ل ٩٢

قورەیشەکان گەلێك خوای جۆراوجۆریان هەبوو، لە هەموویان بەناوبانگتر (هوبەل، لات (اللات و العزی و منواة ثالثه اخری) انجیم)

خەڵکەکەی هەیکەل پەرست بوون گاورو جوو زۆر چەپەڵ
گشتی کردە (مؤمن باللە) نەما لات و هوبەل ل ٩٢

پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤێکی نەخوێندەوار بوو (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ) (الاعراف- ١٥٧)

خوێندەواری نەبوو تەوراتی خوێندبێتەوە
یا نەخۆ ئینجیلی عیسای دیبێ لێی وردبێتەوە ل ٩٣

ئەسیری شانازی بەوە دەکات کە موسڵمانەو، لەسەر ئاینی (محمد) ە (ﷺ)، ئەو پێغەمبەرەی لە کتێبەکاندا ناوی بەگەورە هاتوە وەکو لە قورئاندا باسی گەورەیی و ڕەوشت بەرزی دەکات: (وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ) (القلم- ٤) هەروەها لە ئینجلدا ناوی هاتوە کە قورئان دەفەرموێت:

فەخر ئەکەین سەربەکەسێکین لە جیهان یەکتایە
بە هەموو کردەوەی چاکەو بە کتێب و ئایە ل ٩٦

لەناو قورەیشەکان هونەری ڕەوانبێژی باوی هەبوو، گەلێك ئەدیبی گەورەیان لێ هەڵکەوتوە، کە شیعری عەرەبیان گەیاندبووە لوتکە، بەڵام کاتێك قورئان هاتە خوارەوە سەریان سوڕما لە ئیعجازی قورئان، بۆیە قورئان تەحەدای هەردوو

شارستانیەتی ئینس‌و جن دەکات‌و دەڵێت: (لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا) (الاسراء- ٨٨)

سەرفرۆی قووەیی ئیعجازی کەلامن بولەغـــا
شیعریان نەسـره نەیان زانی کتێبـــی ئودەبا
موتەحەییر بوون لە تەئسیری وتەی ئەو خوتەبـا
کە موحەممەد لە کەسێ دەرسی نەدی ئەلف‌و با ل ٩٦

شاعیر شاهیدی دەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) سەردەستەی مرۆڤایەتیـە، کـە بـە ئاینـە تازەکەی کە ئیسلامە خزمەتێکی گەورەی بە مرۆڤایەتی کـردووە، مرۆڤایـەتی لـەژێر سێبەری ئەو ذاتە بەڕێزە حەساوەتەوە:

خزمەتێکی بەشەرە دینی موبینـــی پاکی
پاکی یەو ژینە، لەگەڵ یەکترا کردەیی چاکی
مەردی‌و بەرزی بۆ یاریدەوهەم بێباکـــی
یا موحەممەد لەبەشەر اشهد بالله تاکـــی ل ٩٦

سـەرچاوە:

١- دیوانی نەسیری/ شێخ عەبدوالخالیقی شێخ حوسێنی نەقشەبەندی، کۆکردنەوەو لەسەر نوسینی/ مستەفا عەسکەری/ بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم ١٩٨٧/ چاپخانەی الحوادث.

# نـــاوەرۆك